زنجیرەی ئیسلام و زانست

1

# قورئان و گەردوونناسی

ئامادەکردنی
سەروەر ڕەحمان

پێداچوونەوەی زانستی
دکتۆر مەریوان احمد رشید

قورئان و زانست

1

زنجیرەی قورئان و زانست (٦)

# قورئان و گەردووناسی

ئامادەکردنی

**سەروەر حەسەن**

پێشەکی بەقەڵەمی

**مامۆستا نەشئەت غەفور**

سەرۆکی ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی

پێداچوونەوەی زانستی

**د.مەریوان ئەحمەد ڕەشید**

یاریدەدەری پرۆفیسۆر لە گەردووناسیدا

پێداچوونەوەی زمانەوانی

**م. محمد شريف صالح**

بەکالۆریۆسی زمانی کوردی



ناوی کتێب بەکوردی: قورئان و گەردوونناسی
ئامادەکردنی: سەروەر حەسەن
پێداچونەوەی زانستی: د.مەریوان ئەحمەد ڕەشید
پێداچونەوەی زمانەوانی: م. محمد شریف صالح
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە: جمعە صدیق کاکە
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٢ك - ٢٠١١ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپیاردنی ( ١٣٢٠ ) ساڵی ٢٠١١ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

## ناوەرۆك

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەکی

**بەقەڵەمی مامۆستا نەشئەت غەفور**

**سەرۆکی ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی**

**زانستی لە قورئان و سوننەتدا**

لـە حـەفتاکانی سـەدەی ڕابـردوودا و لـەنێو دونیـای زانـین و زانیاریـدا چاومان کەوت بە کتێبی (الإنسان ذلك المجهول)، دەستمان بە خوێندنەوە و لێکۆڵینـەوەی کـرد و نهێنیـەکانی بەدیهێنـەر و مـەزنیی ئـەو زاتـەمان بـۆ دەرکەوت، ئەوەش لـە میانـەی زانینـی نهێنییـەکانی خانـەی زینـدەوەران و توێکاری مرۆڤەوە. ئیتر زانستی پزیشکی و توێکاریی بوونە میحرابی باوەڕ، خودی مرۆڤ خۆی موعجیزەیەکی زیندووە... لەڕاستیدا هەرچەند لە زانینـی نهێنیەکانیشدا پێشڕەوی بکەین هێندەش پەی بە ڕاستودروستی ئەو وتەیـە دەبـەین کـە مرۆڤـی هاوچـەرخ هـەر بەدەسـتی خـۆی لـەناودەبات، شارسـتانیەتی مـاددیش مرۆڤـی گۆڕیـوە بـۆ تـەنها ئامێرێـك کـە خاڵیـە لـە خۆشەویستی و بەها بالاکان.

بێگومـان ئەگـەر کامـەرانی و تـەواوێتیمان بوێـت، دەبێـت سـەرلەنوێ تەواوی کەسێتی مرۆڤ بگۆڕین و ئاسودەیی خێـزان و ڕۆڵ بـۆ دایـك و بـاوك

بگێڕینەوە لە پەروەردە و گەشەی سۆزداریدا، دەبێت مرۆڤ بۆ بنچینەی ڕاستەقینەی خۆی بگێڕینەوە تاكو (نێر) نێر بێت و (مێ)یش مێ بێت، بەجۆرێكی ئەوتۆ كە بەهیچ شێوەیەك خەسڵەتەكانی ئەقڵ و ئارەزووە زایەندی و خواستەكانی ڕەگەزی بەرامبەر لەخۆیدا دەرنەخات.

بەباوەڕی من ناسینی مرۆڤ لە بەدیهێنانەوە لە ﴿مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ﴾ تاكو گواستنەوەی لەم ژیانەوە بۆ ژیانی بەرزەخی، دەبێتە هۆكاری نزیكخستنەوەی كەسەكە لە ناسینی ئیعجازی پەروەردگار لە بەدیهێنانیدا.

ئایا چاو موعجیزە نییە؟

ئایا زمان موعجیزە نییە؟

ئایا مێشك موعجیزە نییە؟

ئایا دڵ موعجیزە نییە؟

ئایا سوڕی خوێن موعجیزە نییە؟

ئایا خانەكانی جەستەی مرۆڤ كە بەشێوەی جۆراوجۆر هەن و هەریەكەیان ڕۆڵی تایبەت بەخۆیان دەگێڕن، موعجیزە نین؟

ئایا یادگا (زاكیرە)ی مرۆڤ موعجیزە نییە؟

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾.

پێغەمبەر (ﷺ) پەرتوكی خوێنراوەی خوای گەورەی لەماوەی (٢٣) ساڵدا بۆ دابەزی، هەر بە قورئان تەحەددای ئەهلی ڕەوانبێژی و زمانی كرد، ئەوان بێتوانا و كەمدەست بوون لەوەدا كە هاوشێوەی قورئان بهێنن لەجیهانی هزر و ڕوونكردنەوە (بیان)دا، تەحەددیەكە بەردەوام بوو و تا ئەبەدیش هەر بەردەوام دەبێت.

﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴾الإسراء/٨٨.

مەعالیمەکانی هزر و ڕۆشنبیری مرۆڤ گۆڕاون و زانست بووەتە منارەی پێشکەوتن و ئاوەدانی، ئیتر تەحەددیکردن بە ئیعجازی زانستی لە پێگەکانی زانستدا دەستیپێکرد.

هەروەها ئیعجازی یاسادانان لە بنچینە و بنەماکانی یاسا و سیستمەکاندا.

ئیعجازی پەروەردەیی لە بونیاتنانی قوتابخانە و پەیمانگاکاندا.

ئیعجازی گەردوونی لە گەردوونی بینراودا.

ئیعجازی پزیشکی لە نهێنییەکانی جەستە و دەرووندا.

ئیعجازی ژینگەیی لە هاوسەنگی ژینگەییدا.

ئیعجاز، قوتابخانەیەکی قورئانیی نوێی بانگەوازی ڕێی خوای میهرەبانە.

ئەمڕۆ مرۆڤایەتی لەوپەڕی پێویستیدایە بۆ باوەڕ و هاوسەنگی، بۆ بەها و ڕەوشتە بالآ و جوانەکان، بۆ ئایین و ڕێگای ڕاست و دروست.

دەبێت باوەڕ بە سادە و سانایی وەربگیرێت، وەك لەم ئایەتەدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلۡفُلۡكِ ٱلَّتِي تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٖ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖ وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلۡمُسَخَّرِ بَيۡنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴾البقرة/١٦٤.

ئەم هەشت پۆلە لە بەڵگە گەردوونییەکان لەسەر توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە و خوێندنەوەی گەردوونی بینراو، ئەمە و دەیان نموونەی تر

لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز، بیركردنەوە دەكەنە فەرزێكی ئیسلامی. ئایین بوونی نییە بەبێ ئەقڵ، بەبێ پەیبردن (إدراك) ئایین نییە.

ئایین بۆ ژیانە و لە بەرژەوەندی مرۆڤەكانە.

مرۆڤ هەمیشە ویردی سەر زمانیەتی، دەڵێت: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾البقرة/٢٠١.

ئیسلام لە پاشماوەی ئایینەكانی تر جیاوازە، بەوپێیەی جەخت لە ئەقڵ و بیركردنەوە و زانست و گەڕان و وردبوونەوە دەكات. لە قورئانی پیرۆزدا نزیكەی (١٠٠٠ ئایەت) هاتووە دەربارەی گەردوونناسی و زەویناسی و ژیانی مرۆڤ و بوارەكانی تری زانست.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿داواكردن و گەڕان بەدوای زانستدا لەسەر هەموو موسڵمانێك فەرزە، هەموو شتێك داوای لێخۆشبوون بۆ داواكاری زانست دەكات، تەنانەت نەهەنگی دەریاش﴾.

لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە: ﴿باشترین كارەكان بوونی زانست و زانیارییە دەربارەی خوای گەورە، زانست سوودت پێدەگەیەنێت كاری كەمی لەگەڵدا بێت یان زۆر، نەزانی و نەفامیش سوودت پێناگەیەنێت كاری كەمی لەگەڵدا بێت یان زۆر﴾.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿داواكردنی زانست و زانیاری لای خوا لە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و جیهادكردن لەڕێی خوادا باشترە﴾.

لەڕاستیدا ئەو هەوڵانەی لە بواری ئیعجازی زانستیدا دراون ئەو ڕاستییە دووپاتدەكەنەوە كە پاش تێپەڕبوونی چواردە سەدە هێشتا قورئانی پیرۆز لەسەر شێواز و پیت و وشە و ئایەتەكانی خۆی پارێزراوە، خوای گەورە پەیمانی پارێزگاریكردنی داوە لە تێكدان (تحريف) و گۆڕین و شێواندن،

پــەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾القيامـــة/١٧، يـــان فەرموويەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾الحجر/٩.

مرۆڤايەتی هەر لەباری پێويستييدا دەمێنێتەوە بە هۆكارێك كە ئارامی و سەقامگيری و ئاسايشی گيانی و دەروونـی بۆ بگێڕێتـەوە، ئـەوەش تـەنها لــەڕێی يـــادی خـــوای مەزنـــەوە دەبێـــت: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾الرعد/٢٨.

گـەردوون وەك پـەرتوكی بينـراوی خـوا دەمێنێتـەوە كـە لێوانلێـوە لـە ئيعجازی بەديهێنان و سيستمی پـڕ لـە سەراسيما، مـرۆڤيش وەك هـەڵگری چەندين وردەكاری بەديهێنان و دەرخەری توانـای بێسـنووری پـەروەردگار، ئـەم ئايەتـە پـيرۆزەش هەميشــە بــە درەوشـاوەيی دەمێنێتــەوە كــە دەفەرموێت:

﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾فصلت/٥٣.

نەشئەت غەفور سەعيد

سلێمانی ٢٠/رەجەب/١٤٣١

# بەر لە دەستپێک

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، هەزاران درووود وسڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری ئازیز و یارو یاوەرانی تا ڕۆژی دوایی...

قورئان پەرتوکی خوای گەورەیە و بۆ مرۆڤایەتی دابەزیوە و لێیەوە مرۆڤ فێری چۆنیەتی ژیان و ڕێکخستنی پەیوەندیی دەبێت لەگەڵ خود و خوا و خەڵك و گەردوون.

قورئان وتەی خوای میهرەبانە، لە قورئاندا خوای بە بەزەیی و بەخشندە بۆ مرۆڤ دواوە، وتەی خۆیی بۆ ناردووە، لە هەندێك مەسەلەدا ئەو زاتە مەزنەی توانای بێسنووری بەسەر هەموو نهێنی و ئاشکراکاندا هەیە سوێندی بۆ مرۆڤ خواردووە، مرۆڤێك کە وەك قەوارە و هێز و زانست بەرامبەر پەروەردگار هیچ نییە، هیچ هیچ... ئەو خوایە ڕێزی لێناوە ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾.

خوای گەورە وایکردووە ئێمە لە وتەکانی تێبگەین، ئەمەش یەکێکە لە گەورەترین بەخششەکانی بۆ مرۆڤ.

ئەم قورئانە هەموو لایەنەکانی پەیوەست بە ژیانی مرۆڤی گرتوەتەوە و هیچ لایەنێکی فەرامۆش نەکردووە (سیفەتێکی ئەم قورئانە ئەوەیە گشتگیرە و بۆ هەموو سەردەمەکانە). یەکێك لەو لایەنانە ئامارە زانستییەکانی ئایەتە قورئانییەکانە کە ئێستا قوتابخانەی ئیعجازی زانستی لێکۆڵینەوەیان دەربارە دەکات.

جێی ئاماژەیە هەنـدێك لـەو توێژینەوانـەی دەربـارەی ئـەو ئایەتانـە کـە ئاماژەی زانستیان تێدایە، دەتوانرێت پێیبوترێت ئیعجازی زانستی قورئـان، بەڵام هەندێکی تریان لەوە بەدەر نین کە ڕاڤەیەك یان خوێندنەوەی زانستی بن بۆ ئایەتەکان.

خوێنەری بەڕێز! ئەم کتێبەی بەردەستت یەکێکـە لـەو زنجیـرە شـەش بەرگیەی دەربارەی ئایەتە زانستییەکانی قورئانی پیرۆز (کە لەماوەی پێـنج تــا شــەش ســاڵدا) ئامــادەکراوە: "قورئــان و گەردوونناســی، قورئــان و زەویناسی، قورئان و دەروونناسی، قورئـان و زانسـتی پزیشـکی، قورئـان و ئاژەڵناسی لەگەڵ قورئان و ڕووەکناسی"... ئێمە لـەم زنجیرەیـەدا خۆمـان پەیوەست نەکردووە بەوەوە کە سەرجەم بابەتە هەڵبـژێردراوەکان لـەڕووی ئیعجازبوونیانەوە ساغ کرابنەوە، بەڵکو ئیعجازبوونی هەندێك لـە باسـەکانی نێو ئەم زنجیرەیە سەلمێنراون و هەندێکی تریشیان تـەنها خوێندنەوەیـەکی زانستی و هاتنەوەی زانستە لەگەڵ ئایەتەکاندا.

لەڕاستیدا جگە لە "قورئان و دەروونناسی" کـە وەرگێـڕدراوی بەشـێکی زۆر لە بابەتەکانی نووسراوێکی "ئەندازیار عبدالدائم الکحیل"ە کە توێژەر و چالاکێکی بواری ئیعـازی زانسـتییە، سـەرجەم بەرگـەکانی تـر ئامـادەکراون (بابەتەکان لە کتێب و سیدی و پێگـە ئەلیکترۆنییەکانـەوە هەڵبـژێردراون و وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی).

لەلایەکی ترەوە لەم زنجیرەیەدا خۆمان پەیوەست نەکردووە بەوەوە کە بابەتەکان بـە دووردرێـژی و سـەرجەم وردەکارییەکانیانـەوە بـاس بکـەین، بەڵکو زۆرینەی بابەتەکان کورت و پوختن، هەوڵمانداوە زۆربەی هەرە زۆری ئایەتە زانستییەکان لە بوارە دیاریکراوەکاندا لەخۆبگرن.

خاڵێکی گرنگ کە تایبەتمەندی ئەم زنجیرەیەیە، پێداچوونەوەی زانستی و زمانەوانییە لەلایەن پسپۆڕانی بوارەکانەوە. ڕێز و خۆشەویستی بێپایانم بۆ یەک یەکی ئەو بەڕێزانە هەیە کە ئەرکی پێداچوونەوەیان لەئەستۆگرت.

ئەو مامۆستا و هاوڕێ ئازیزانەم کە پێداچوونەوەی زانستیان بۆ بابەتەکان کرد، بەڕاستی کارەکەیان زیاتر زانستی کرد، تێبینی و سەرنجی ورد و زانستیانەیان دەربارەی تاک تاکی بابەتەکان پێدام، یان پێباشبوونیان پێوتم، خۆشحاڵبووم ئەو ئازیزانە بوونە هاوکاری ئەم کارە سادەیمان، دەبێت خوای گەورە خۆی پاداشتیان بداتەوە.

لەلایەکی تریشەوە ئەو خوشك و برایانەم کە پێداچوونەوەی زمانەوانیان بۆ زنجیرەکە ئەنجامدا گەلێك جوانکاری و ڕاستکاریان بۆ کارەکە کرد، چاکنووسی و جواننووسیان بۆ شێوازی دارشتن و وشە و دەربڕینەکان پەسەندکرد، دەستخۆشی و نزای خێرم بۆیان هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا دیارە هەر کارێك خاوەنەکەی مرۆڤ بوو، لە کەموکوڕی بەدەر نییە. هەر هێندە دەتوانین و دەزانین داوای لێخۆشبوون و پێدانی حیکمەت لە خوای گەورە بکەین.

خوای گەورە دڵسۆزی و داناییمان پێبدات و بەمیهرەبانی خۆی ئەو کارانەی کە خۆمان بەباشیان دەزانین، لێمان وەربگرێت.

سەروەر حەسەن

سلێمانی/ ٢٠١٠

# دیاردەی پێکبەستویی و لێکهەڵوەشان
# (الرتق والفتق)

کاتێـك مــرۆڤ دەڕوانێتــە درەخــت و بەروبوومــەکانی زەوی و بــەهار، دەپرسـێت ئـاخۆ کـێ بەوشـێوە جوانـە ڕازاندویەتیـەوە؟ پاشـان دووبـارە لــەوەرزی زسـتاندا چـاودەگێڕێت، دوایـی پـاییز، دەپرسـێت: کـێ زەردی بــەدوای سـەوزیدا دەهێنێـت و گـەڵا زەردە وەریوەکـان بــەهۆی (بــا)وە بڵاودەکاتــەوە؟ لـە بـەهاری داهاتووشـدا ورد دەبێتـەوە، کـێ خەنـدەی بـۆ شەونمەکان گێڕایەوە و پێکەنینیش بۆ بـەیانیانی باخچە ڕازاوەکـانی سـەر زەوی؟

خــوای گــەورە وەڵام دەداتــەوەو دەفــەرموێت: ﴿ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾الـروم/١١، واتـە: هـەر خـوا خـۆی دروسـتکراوان دەهێنێتــە مەیــدان و دوایــی وەك خۆیــانی لێدەکاتــەوە، ســەرەنجامیش گەڕانەوەتان (ئەی گرۆی ئادەمیزاد) هەر بۆ لای ئەو زاتەیە.

ئەمانەو مرۆڤ تەماشای گەردوونی کردووە و لێی کۆڵیوەتەوە، نموونـەی لەو نەیزەکانـە کۆکردۆتـەوە کـە کەوتونەتـە سـەرزەوی و نموونـەی لەتەنـە ئاسمانییـەکانی تـری وەك مـانگ وەرگرتـووە. ئەسـتێرەو گەلەسـتێرەکان لـەڕێگای وێنـەگرتنی ڕووناکییـەوە دەپشـکنێت، کـە لەدوورییـەکی زۆرەوە

ئـەنجام دەدرێـت و پاشـانیش هەڵدەسـتێت بـە شـیکارکردنی شـەبەنگە دەرچووەکان لەو ئەستێرانەوە و بەوەش مـرۆڤ گەیشتووەتە باوەڕێك کـە هەنووکە هەموو بەرەنجامەکانی زانست پشتگیری لە ڕاستییەکەی دەکـەن، ئـەویش کـورت دەبێتـەوە لەمـەدا: گـەردوون بارسـتەیەکی هـەوریی گـازی دوکەڵیی کڵپەسەندووی یەکگرتوو بووە.

سەرجەم پێکهاتەکانی گەردوون لە خۆر و مانگ و ئەستێرە و دار و بەرد و مـرۆڤ لـە سـێ ڕەگـەزی سـەرەکی پێکـدێن کـە ئـەلیکترۆن و پرۆتـۆن و نیوترۆنەکانن... ئەم یەکێتییە لە پێکهاتەی گەردووندا، دڵنیایی پتر لەسـەر بیرۆکەی یەکپارچەیی سەرەتا دەدات. گەردوون یەك یەکە بووە لە شـێوەی هەور و دووکەڵ، لەپاشان لەیەکتر جیابوونەتەوە بۆ پێکهێنـانی ئەسـتێرەو گەلەستێرە و هەسارەکان و زەوی.

خـــوای پـــەروەردگار لـــە قورئـــانی پـــیرۆزدا دەربـــارەی چـــۆنیەتی جیابوونـەوەی گـەردوون دەدوێـت و دەفـەرموێت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ (٣٠) وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ (٣١) وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ (٣٢) وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴾ الانبيـاء/٣٠-٣٣، واتـە: ئایا کـافر و خوانەناسـان نـابینن و بۆیـان ڕوون نەبووەتەوە کـە ئاسمانـەکان و زەوی یەکپارچـە بـوون و لـەوەودوا لێکمان جیاکردنەوە، لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێنا، ئایا ئـەوان هەر باوەڕ ناهێنن، لەزەویشدا کەژ و کێوەکانمان چەسپاندووە، تـا لاسـەنگ نەبێت و لارنەبێتەوە و هەڵیان نەگێڕێتەوە، لە لاپاڵی چیاکان و لە دۆڵەکاندا

ڕێبازمان سازاندووە، تا خەڵکی ژیان بۆ خۆیان دابین بکەن و ڕێبازی هیدایەت بگرنەبەر و ڕێیان لە گەنجینە و ناز و نیعمەتە شاراوەکان بکەوێت، ئێمە ئاسمانمان کردووە بە سەقفێکی پارێزەر کەچی ئەوانە ڕوویان لەو هەموو نیشانە و بەڵگانە وەرگێڕاوە. هەر ئەو زاتەیە کە شەو و ڕۆژی بەدیهێناوە، خۆر و مانگیشی دروستکردووە، هەریەکەیان لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە.

ئەم ئایەتانە کۆمەڵێك زانیاری ورد و دەقیقمان دەدەنێ، لەوانە:

١- ئاسمانەکان و زەوی پێکەوەنوساو و یەککگرتوو بوون: ﴿كَانَتَا رَتْقًا﴾

٢- پاشان هەموو لێك جیاکراونەتەوە: ﴿فَفَتَقْنَاهُمَا﴾.

٣- ئەو زاتەی لێکی جیاکردوونەتەوە نەناسراو نییە، بەڵکو ئەو زاتە (الله) یە کە لەسەرەتادا هەموو گەردوونی بەدیهێناوە: ﴿فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ واتە ئێمە لە یەکترمان جیاکردنەوە.

٤- یەکەم کەس ئەم زانستە دەزانێت و دەینوسێت و بڵاویدەکاتەوە ئەوانەن کە بێباوەڕن: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾، واتە: ئایا کافر و خوانەناسەکان نابینن؟

٥- ئاو دەچێتە پێکهاتەی ژیانی هەموو زیندەوەرێکەوە: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾، واتە: لە ئاو هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێنا... زانستی نوێش بەم زانیارییە گەیشتووە، هەتاکو ئەوەش زانراوە کە هۆکاری ژیانی ڤایرۆس و بەکتریاش هەر ئاوە.

٦- خــوای گــەورە لــە ســەرەتادا زەوی بــەدیهێناوە، پاشــان زەوی نــاجێگیر دەبــوو تــاکو خــوای گــەورە بــەهۆی شــاخەکانەوە جێگیریــی و هاوســەنگی بــە زەوی بەخشــی: ﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ﴾ واتە: لە زەویشدا کەژ و کێوەکانمان چەسپاندووە تـا لاسـەنگ نـەبێت و لار نەبێتەوە و هەڵیان نەگێڕێتەوە.

پاشــانیش دوای ئــەو لێکجیابوونەوەیــە گــەردوون بەســەرجەم وردەکارییەکانییــەوە دروســتبوو: ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾.

٧- خــوای گــەورە ســەقفێکی پــارێزەری بــۆ زەوی دروســتکردووە، سەرەتای ئەم سەقفەش بریتییە لە بەرگەهـەوای دەوری زەوی: ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ﴾ واتــە: ئێمــە ئاسمانمــان کردووە بەسەقفێکی پارێزەر، کەچی ئەوانە ڕوویان لە هەموو ئەو نیشـانە و بەڵگانە وەرگێڕاوە.

لەپێش دروستبوونی بەرگەهـەوا و پـێش دروسـتبوونی ژیـان، شـوهب و نەیزەکەکان و تیشکە زیانبەخشەکانی خۆر بەر زەوی دەکەوتن، بـەڵام ئـەو بەرکەوتنانە بەهۆی ئەم سەقفە پارێزەرەوە نەمان و کۆتاییان پێهات، دەنـا ژیانیش لەسەر زەوی بەم شێوەیە بەردەوام نەدەبوو.

٨- پاش هەڵوەشان و جیابوونەوەی گـەردوون، هەریـەك لـە هەسـارە و ئەستێرەکان شوێنی خۆیان وەرگرت، بەتـەواوی وەك ئـەوەی خـوای گـەورە بۆی دیاری کردوون... دوای ئەوەی خۆر شوێنی خۆی گرت، تیشکەکانی بۆ کۆمەڵەکەی دەنێرێت و وەك فەرمانی پێکراوە کۆمەڵەکەی (کۆمەڵەی خـۆر)

بەهۆی هێزی کێشکردنەوە دەپارێزێت، تا شەوو ڕۆژ پێکدێنێت :﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾، واتە: هەر ئەو زاتەیە کە شەو و ڕۆژی بەدیهێناوە.

٩- دوای ئەوەی هەریەك لە ئەستێرە و هەسارەکان شوێنی خۆیانیان گرت، لەو ناوچەیەی لە فەزادا بۆیان دیاریکراوە دەستیان بە مەلەکردن کرد، بەئاڕاستەیەکدا کە خوای گەورە فەرمانی پێکردوون: ﴿وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾، (خۆر و مانگی دروستکردووە هەریەکەیان لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە).

وەك زانراوە گەلەستێرەکان تائێستاش (لە کاتی لێك جیابوونەوەکەوە) بە بەردەوامی لێك دووردەکەونەوە و گەردوون لەو کاتەوە بە یەکبینەیی لە فراوانبووندایە. ئەم فراوانبوونەش بەردەوامە و بەخێراییەکی زۆر گەورەیە و جوڵەکەشی وەك جوڵەی خۆر و کۆمەڵەکەیەتی، بەڵام ئەم جوڵ ەو فراوانبوونەی گەردوون تائەبەد بەردەوام نابێت، بەڵکو تاکو کاتێکی دیاریکراو و سنووردارە.

خوای گەورە بۆ هەموو شتێك ماوەیەکی دیاریکراوی داناوە و هەر ساتێکیش ماوەی جوڵە و فراوانبوونی گەردوون دواییهات، ئیتر گەردوون بۆ حاڵەکەی سەرەتای دەگەڕێتەوە (حاڵەتی پێکبەستوویی و دووکەڵی) بەتەواوی وەك سەرەتا کە دەستی پێکردووە.

هەروەك چۆن مرۆڤ تەمەنێکی دیاریکراوی هەیە و لەپاش ئەو تەمەنە ئیتر دەمرێت، گەردوونیش بەهەمان شێوە، خوای گەورە بۆ حاڵی سەرەتا کە بەدیهێناوە، دەیگێڕێتەوە. ئەوەش لە ڕۆژێکدا کە ئاسمانەکان وەك کتێبێکی کراوە بە فەرمانی خوایی دادەخرێن و دەپێچرێنەوە: ﴿يَوْمَ نَطْوِى

ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥۚ وَعْدًا عَلَيْنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾الأنبيـــاء/١٠٤، واتـــە: ڕۆژێـــك دێـــت ئێمـــە ئاسمـــان دەپێچینەوە، وەکو چۆن کتێبی کراوە دادەخرێت و دەپێچرێتەوە، هەروەك چۆن لە سـەرەتاوە دروسـتمانکرد، وەك ئـەو ساتەی خـۆی لێدەکەینـەوە. ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەم کارە ئەنجام دەدەین.

## تەقینەوە گەورەکە

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا﴾الأنبیاء/٣٠، واتە: ئایا کافر و خوانەناسان نـابینن و بۆیـان ڕوون نەبووەتــەوە کــە ئاسمانــەکان و زەوی یەکپارچــە بــوون و لەوەودوا لێکمان جیاکردنەوە؟

دەکرێـت بـۆ یەکـەمین دیـدگای مـرۆڤ لەسـەر دروسـتبوونی گـەردوون بگەڕێینەوە بۆ چاخی بەردین، واتە پێش سەدان هەزار ساڵ بەر لـە ئێسـتا، ئەوکاتە کە خورافە دەستی گرتووە بەسەر خەیاڵ و هزری مـرۆڤ و گەشـەی ئـەقڵی لای میسـرییە کۆنـەکان و بابلیـەکان... لای ئـەوان پەیوەندییــەك دەردەکەوێت لەنێوان ئەزەلیەتی گەردوون و خواوەندە جۆراوجۆرەکان کـە لە هزری خۆیاندا دروستیان کردووە و دەسەلاتدارن بەسەریانەوە.

فەیلەسـوفە ئیغریقـی و ڕۆمانییــەکان هــەوڵی دانـانی تیۆریـان داوە بـۆ دیــاردە گەردوونیــەکان، لەکاتێکــدا کــە ئەســتێرەگەریی لــە هــەردوو

شارستانیەتی هیند و چینیدا بەتەواوی بڵاوبووەتەوە.

ئـەو خاسـیەتە گشـتییەی تەسـەوراتی گـەردوونی لای شارسـتانیەتە کۆنەکان چەسپاندووە، پەیوەستیەتی بە جیهانی خواوەنـدەوە و باوەڕی پتەوی بە بوونی جیاوازی بنـەڕەتی لـەنێوان زەوی و ئاسمانـدا، کە ڕێ بە دانانی تیۆرە نـادات دەربارەی گـەردوون و چۆنیەتی دروسـتبوونی، بـەڵام دوای ئەو گەشەسەندنە گرنگەی لەسەرەتای سەدەی بیستـەمدا مرۆڤایـەتی لەبواری فەلەکناسی تیۆرییەوە (Cosmology) بەخۆیەوە بینی، هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی بیردۆزی ڕێژەیی گشتی کە چوارچێوەی ڕاستەقینەی بۆ لێکۆڵینەوەی گەردوون دانا، سەرباری تێڕوانین و چاودێریکردنی گەردوون و دۆزینـــەوەی نایـاب لــە فــەزادا، دەبــوو تیــۆرێکی گشــتی دابنرێــت ئــەو دەرهاوێشتانە ئاوێتـە بکـات بـۆ پێشکەشـکردنی تێڕوانینێکـی یـەکگرتوو و هاوتـا بـە مەبەسـتی ڕاڤـەکردنی گـرنگترین دیـاردە گەردوونییـەکان و لـەو دیاردانەش دروستبوونی گەردوون.

لەڕاسـتیدا مەسـەلەی سـەرەتای دروسـتبوونی گـەردوون یەکێکـە لـەو مەسـەلانەی فەیلەسـوف و زاناکـان لێـی دواون، بـەڵام بەشـێوەیەکی ورد و تێروتەسەل و یەکلاکەرەوانە نەبوو، هەربۆیە ژمـارەی تیـۆر و بۆچوونەکان زۆر بـوون، تـاکو زانـای بـەلجیکی گـەردوونناس "جـۆرج لیماتـەر" لەسـاڵی (١٩٢٧ز)دا دەربارەی سەرەتای دەسـتپێکردنی گـەردوون دوا و وتـی: "لـە سـەرەتای دروسـتبوونیدا گـەردوون بارسـتەیەکی گـازی بـووە، چـڕی و درەوشانەوە و گەرمییەکەی زۆر بەرز و مەزن بوون".

پاشان لەم بارستەیەدا و بەکاریگەری ئـەو پەسـتانە گەورەیـەی لـە پلـە گەرمییە بەرزەکەیەوە دروستبوو، تەقینەوەیـەکی گـەورە ڕوویـدا و پـەرتی کرد و بەشەکانی بەهـەموو ئاراسـتەیەکدا بڵاوەپێکرد. لەگـەڵ تێپـەڕبوونی کاتیشـدا ئەسـتێرە و هەسـارە و گەلەسـتێرەکان دروسـتبوون. هەنـدێك لـە

زانایان ئەم بیردۆزەیان بە بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە ( The Big Bang Theory) ناوناوە.

بەڕای زانایانی فیزیای گەردوون لە بەشێك لەملیار ملیار بەشی چرکەیەك (١٠ ^-٢٤^ چرکە) و بەر لە زیاد لە چواردە ملیار ساڵەوە گەردوون بارستەیەکی مەزنی پلە گەرمی زۆر بەرز بووە و بەقەبارەی گۆیەکیش بووە تیرەکەی ناگەیشتووەتە بەشێك لە هەزار بەشی سانتیمەترێك.

لەساڵی (١٩٤٠ز)دا زانای ئەمریکی بە ڕەگەز ڕووسی (پسپۆڕ لە بواری گەردووناسی) "جۆرج گامۆف" پاڵپشتی تیۆرەی تەقینەوە گەورەکەی کردووە. ئەمەش ڕێی خۆش کرد لە بەردەم هەردوو زانا "بانزیاس" و "ویلسون" لەساڵی (١٩٦٥ز) دا کە شەپۆلە ڕادیۆییەکان لە هەموو بەشەکانی گەردوونەوە وەربگرن، بەجۆرێك کە لە هەر جێگایەکدا تۆمار بکرانایە هەمان خاسیەت و سیفەتی فیزیاییان هەبوو و بەپێی کات و ئاڕاستەش نەدەگۆڕان. ئەم شەپۆلانە ئەوانەن کە لە سەردەمە دوورەکانەوە هاتوون و پاشماوەی ئەو تەقینەوە گەورەیەن لە چرکە سەرەتاییەکانی ڕوودانیدا کە بەدوایدا دروستبوونی گەردوون دێت.

لەساڵی (١٩٨٩ز) دا ئاژانسی بۆشایی ئەمریکی (ناسا) مانگی دەستکردی (Cobe explorer)ی بۆ بۆشایی ئاسمان نارد کە لە دوای سێ ساڵ زانیاری زۆر وردی بۆ زەوی نارد. زانیارییەکان دڵنیایی تەواو لەسەر ڕاست و دروستی تەقینەوە گەورەکە دەدەن.

ئەم ڕاستییە زانستییە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە، لەئایەتی ٣٠ ی سورەتی (الأنبياء)دا هاتووە: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا﴾.

مانای ئایەتەکە بەمجۆرەیە: زەوی و ئاسمانەکان بە ئەستێرە و هەسارە

و گەلەستێرەکانەوە کە هەموویان پێکەوە ئەم گەردوونەی تیایدا دەژین پێکدێنن، لەبنەڕەتدا بریتی بوون لە تەنها یەك بارستەی پێکەوەلکاو، پاشان ئەو بارستەیە تەقیوەتەوە و لەدوای ئەوە ئەستێرە و هەسارە و گەلەستێرەکان دروستبوون، ئەمەش زانایانی گەردوون لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا دۆزیویانەتەوە... هەردوو زانا "بانزیاس" و "ویلسۆن" لەساڵی (١٩٧٨ز)دا خەڵاتی نۆبڵیان لە فیزیادا لەسەر ئەم دۆزینەوەیەیان وەرگرت.

# فراوانبوونی گەردوون

لەساڵی (١٩٢٩ز) دا دۆزینەوەیەکی گەورەی زانستی ئاشکرا کرا، کاتێك کە لە ناوەندە زانستییەکاندا بڵاوکرایەوە دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو. تا ئەوکاتە باوەڕ وابوو گەلەستێرەکان بە جوڵەیەکی هەڕەمەکی وەك جوڵەی گەردی گازەکان دەجوڵێن کە هەندێکیان لەیەکتر نزیك دەکەونەوە و هەندێکی تر لە حاڵەتی لێك دوورکەوتنەوەدان، بەڵام دۆزینەوەکە ئەو بڕوایەی بەتەواوی پێچەوانە کردەوە.

"هابل" دۆزییەوە، هەموو ئەو سەدان بلیۆن گەلەستێرەیەی لە گەردووندا هەن بە بەردەوامی بەخێراییەکی زۆر گەورە لەیەکتری دووردەکەونەوە کە لەهەندێك حاڵدا لەوانەیە خێراییان بگاتە چەند بەشێکی خێرایی ڕووناکی. بەگوێرەی ئێمەوە هەموو ئەو گەلەستێرانەی لە دەوروبەرماندا دەیانبینین (جگە لە ئەندرۆمیدا و هەندێك گەلەستێرەی تری نزیك)، سەرجەمیان لە دورکەوتنەوەیەکی بەردەوامدان لێمانەوە.

مانای دۆزینەوەکە بەم جۆرەیە: مادام هەموو یەکەکانی ئەم گەردوونە لە حاڵەتی لەیەکتر دوورکەوتنەوەیەکی هەمیشەییدان، ئەمە تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە گەردوون لە کشانێکی قەبارەیی یان فراوانبوونێکی یەکبینەدایە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾الذاريات/٤٧، واتە: ئێمە ئاسمانمان بە دەستی پڕ دەسەلاتی خۆمان دروستکرد، بەردەوامیش گەورەو فراوانی دەکەین.

وەك دەزانین ڕووناکی لە حەوت ڕەنگ پێکهاتووە و هەریەك لەو ڕەنگانە شەپۆلێکی تایبەتیان هەیە بە درێژی و لەرەلەرێکی دیاریکراو، کورتترین شەپۆل (بەرزترین لەرەلەر) شەپۆلی ڕەنگی شینە، درێژترینیان و کەمترین لەرەلەریش شەپۆلی ڕەنگی سوورە.

کاتێك "هابل" لێکۆڵینەوەی لەو ڕووناکییە کرد کە لە گەلەستێرەکانەوە دەردەچن، بینی لە هەموو حاڵەتەکاندا (جگە لە ئەندرۆمیدا و هەندێك گەلەستێرەی تری نزیك) لادانێك لە ڕووناکیەکەدا بەرەو ڕەنگی سوور ڕوودەدات. چەندەش بڕی لادان ڕووەو سوور زیادبکات هێندەش دووری گەلەستێرەکە لێمانەوە زیاترە.

لەپاش ئەم دۆزینەوەیە بەڵگەی بوونی ژمارەیەك کونی زۆر تاریك لە گەردووندا دەرکەوت کە لەپشت ئەم کونانەوە هێزێکی کێشکردنی گەورە هەیە لادانی ڕووەو ڕەنگی سوورمان پیشان دەدات. (گەردوون دەکشێت و فراوان دەبێت لە خاڵی سەرەتاوە بۆ تیشکی سوور).

ئێستا و لەپاش گەیشتنی زانست بەو ڕاستییەی گەردوون سەرەتایەکی هەیە تیایدا دەستی بە کشان و فراوانبوون کردووە، ڕوونتر لە مانای ئەو ئایەتە پیرۆزە تێدەگەین: ﴿وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ خوای گەورە دەفەرموێت ئێمە

ئاسمانەکانمان دروستکردووەو ئێمەش فراوانـی دەکـەین... ئەمـە دەقێکـی ڕوونە و تەئویل هەڵناگرێت، هـەر ئەوەیـە ئێسـتا لـە گەردوونـدا ڕوودەدات، بەڵکو چەندین بلیۆن ساڵە ئەم فراوانبوون و کشانە بەردەوامە.

ئاسمانەکان فراوان دەبن و گەردوون دەکشێت. وەك تێبینیمان کرد ئەم ڕاسـتییە تـەنها تیـۆر و گریمانـە و نموونـە نییـە، بـەڵکو بینینـەکان ئـەم ڕاستییەیان سەلماندووە و تەبایی و هاوشێوەی ئەو تاقیکردنەوانەی زۆرێك لـە گەردوونزانـەکان لـە کـات و شـوێنی جیـاوازدا ئـەنجامیان داوە و ئـەم تیۆرەیـان کردووەتـە ڕاسـتییەکی زانسـتی سـەلمێنراو. تـا ئێسـتاش هـیچ دژایەتییەك یان هیچ شتێك نییە لە دروستی ئەم ڕاستییە کەم بکاتەوە.

# هەموو تەنەکان
# لەڕێرەوی تایبەتی خۆیاندا مەلەدەکەن

یەکێك لەخاسیەتەکانی گەردوون ئەوەیە هەر توخمێك لە توخمەکانی و هەموو گەردیلەکانی ئەم توخمانە (تەنانەت ئەگەر کێشەکەی هێندەی ئەتۆمێکیش بێت)، لە جوڵەیەکی یەکبینەدان و تائەبەد ناوەستن مەگەر بە فەرمانی خوا نەبێت، خوای بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکان و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە.

بەدڵنیاییەوە ئەم جوڵەیە بە ڕێکەوت نییە، یان بەو جۆرە نییە مادده خۆی هەر لەخۆیەوە ئەو کارە بکات (وەك بێباوەڕان بانگەشەی دەکەن)، بەڵکو جوڵەیەکی بەیاساکراو و دیاریکراوە لەلایەن پەروەردگارێکی کارزانەوە، چونکە جوڵەی تەنەکان لە گەردووندا لەدەرەوەی یاساکانی زانستی دانراون کە مرۆڤ داینـاون و زانیونی و لە دەوروبەری خۆیدا و لەزەوی و گەردووندا دۆزیونیەتەوە.

هەریەکە لە ئەستێرە و هەسارە و گەلەستێرەکان بە جوڵەیەکی تەوەرەیی بەدەوری خۆیاندا و بەجوڵەیەکی جێگۆڕکێ لە خولگەکانیاندا دەسوڕێنەوە. زیاتر لەوەش هەموو گەردوون بەدەوری چەقێکدا دەسوڕێتەوە کە زانستی مرۆڤ (کەم تا زۆر) هیچی لەبارەوە نازانێت و تەنها لە زانستی خوای تاك و تەنهادایە.

گەرچی مرۆڤ بتوانێت هەندێك لە یاسا دەربارەی جوڵەی تەنەکانی سەر زەوی و نزیك زەوی بزانێت، بەڵام هەر کەمدەست و بێتوانا دەبێت لە زانینی زۆرێك لە مەسەلە شاراوەکانی جوڵەی تەمگەلەکان و هەسارەکان و گەلەستێرە و ئەستێرە کلکدارەکان و...هتد. ئەو دیاردانەی مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی دەیانبینێت و وا دەزانێت جێگیر و وەستاون و جوڵەیان نییە (وەك شاخەکان و بان و دەریاکان)، لەڕاستیدا هەموو ئەوانە لەجوڵەیەکی بەردەوامدان بە هاوکاتی لەگەڵ جوڵەی زەوی خۆیدا، بە جوڵەیەکی تەوەرەیی و جێگۆڕکێ و جوڵەکانی تریش.

ئەم جوڵە بەردەوامە ڕێکوپێکەی سەرجەم پێکهاتەکانی ئەم گەردوونە فراوانە کە ماندووبوون و وەڕسبوون و هەڵە نازانن، تەسبیح و سوژدەن بۆ پەروەردگاری مەزن و بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیاندایە، بەڵام مرۆڤ بەو کەمە زانستە سنووردارەی هەیەتی لەو جۆرە تەسبیحاتە تێناگات.

لە جوڵەی هەر بەشێك لە بەشەکانی ئەم گەردوونەدا سوود و بەخشش و بەرەکەت هەیە بۆ مرۆڤ (دانیشتوی سەر ڕووی هەسارەی زەوی)، چونکە بە فەرمانی خوای گەورە و میهرەبان هەموو پێکهاتەکانی گەردوون بۆ خزمەتی مرۆڤ و ئاسانکردنی ڕێگاکانی ژیانی لەسەر زەوی هێنراونەتە بوون.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ﴾ یس/ ٤٠، واتە: نە خۆر بە مانگ دەگات و نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت، بەڵکو هەریەکەیان لەڕێڕەوی تایبەتی خۆیاندا مەلەدەکەن .

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسۡبَحُونَ﴾الأنبياء/٣٣، واتە: هەر ئەو زاتەیە شەو و ڕۆژی بەدیهێناوە، خۆر و مانگیشی دروستکردووە، هەریەکەیان لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە و مەلەدەکەن.

لەئەنجامی جوڵەی تەوەرەیی ئەستێرە و هەسارەکاندا چەقە هێزێکی دوورخســتنەوە (قــوة طـرد مرکــزي) دروســتدەبێت کــە دەبێتــە هــۆی هێشـتنەوەی ئەسـتێرە یـان هەسـارەکە لـە خولگـە تایبەتییەکـەی خۆیـدا (هێشتنەوەی دووریی نێوان ئەو هەسارە و ئەستێرەیە لەگـەڵ ئەسـتێرەی دایکدا لە دوورییەکی جێگیر و نەگۆڕدا). ئەو هۆکارانـەی کـار دەکەنـە سـەر بەردەوامبوونی پەیوەستی ئەستێرە و هەسـارەکان پێکـەوە، لـەم خاڵانـەدا دەردەکەوێت:

- بارستایی ئەستێرە (خۆر)ی دایك.
- سوڕانەوەی تەوەرەیی خۆر.
- هێزی ڕاکێشانی خۆر.
- بارستایی هەموو هەسارە پاشکۆکانی خۆر.
- بەردەوام سوڕانەوەی تـەوەرەیی هەریـەك لـە هەسـارەکان بـەخێرایی نەگۆڕ.
- هێزی دوور خستنەوەی ناوەند (سەنتەر)ی هەریەك لە هەسارەکان.
- دووریی نێوان خۆر و هەسارەکان.

ســەرەڕای ئــەو هۆکارانــە و درێــژ خایانــدنی کارەکــەی لەســەرەتای دروستکردنیەوە تاکو ئەمڕۆ کە بە چەندین بلیۆن ساڵ مەزەنـدە دەکرێت، ئەو خۆر و ئەستێرە و هەسـارانە بـەبێ هەڵـە و لادان و تێکچوون جـوڵاون،

چـونکە ڕامبوونیـان بـە فـەرمانی خـوای پـەروەردگاری مەزنـە و ملکەچـی ڕێکەوت و بێسەرەوبەرەیی نین. ڕوودانـی لادانێکـی زۆر بچـووك لـە هەریـەك لەو هۆکارانـەی باسـکران دەبێتـەهۆی نـەمانی هێـزی نێـوان خـۆری دایـك و هەسـارەکانی، لەمەشـەوە تەقینـەوە و پـەرتبوون و لـەتبوون ڕوودەدات، ئەمەش تەنها کاتێك ڕوودەدات بەدیهێنەری گەردوون فەرمانی ڕوودانی بدات (لە هاتنی قیامەتدا).

ڕۆژی قیامـەت ئـەو ڕۆژەیـە کـە گـەردوون حاڵـەتی هاوسـەنگی خـۆی لەدەست دەدات و ئەستێرە و هەسارە و مانگـەکان بـە فـەرمانێك لەلایـەن خواوە بەهیچ جۆرێك لـەت نابن، زەویش بـەڕوودانی ئـەو زەمینلەرزەیـەی پـەیمان دراوە ڕووبـدات کاریگـەر دەبێـت، هـەموو مـاددە کانزاییـەکان لـە ناواخنیانـەوە دێنـەدەرەوە و بـەوەش هاوسـەنگی و هێـزی کێشـکردنی و شوێنەکەی لە بۆشایی ئاسماندا لە دەستدەدات.

لەئەنجامی جوڵەی تەوەرەیی خۆر، ئەو گازانەی بەڕێگەی ناوکی کارلێك دەکەن، لەناواخنیدا چڕدەبنەوە و هێزێکی گەورەی کێشکردنی لێوەدروست دەبێت (بە هۆی بارستاییە زۆر گەورەکەیـەوە کـە بـە ٣٣٣هـەزار هێنـدەی بارسـتایی زەوی مەزەنـدە دەکرێـت)، ئەمـەش کاریگەرییـەکی زۆری هەیـە لەسـەر هێـزی کێشـکردنی هەسـارە پاشـکۆکانی و پەیوەسـتکردنی بـە خولگەکەیەوە و دروستکردنی کۆمەڵە یان سیستمی خۆریی.

تیشـکی خـۆر تواناکـەی لـەو وزە زۆرە مەزنـەوە وەردەگرێـت کـە لـە کارلێکە ناوەکییەکانی ناواخنی خۆردا ڕوودەدەن، وزەی خـۆر لـە ئـەنجامی یەککگرتنی گەردیلەکانی هایدرۆجینی سوکەوە پەیدا دەبێت.

بەبێ بەردەوامبوونی جوڵەی تەوەرەیی خـۆر، دروسـتبوونی وزەی خـۆر دەوەستێت و لەگەڵ کاتدا نوێ نابێتەوە. ئەگەر ئەو جوڵەیەی نەبوایە خـۆر

بـەر لـە هـەزاران ملیـۆن سـاڵ دەبـووە ئەسـتێرەیەکی مـردوو و هێـزی کێشکردنی ون دەکرد و هۆکارەکانی پەیوەستبوونی نێوان خۆر و هەسارە پاشکۆکانی لە بۆشایی ئاسماندا هەڵدەوەشان... هـەر ئـەو پەیوەستیەی نێوان هەسارە و ئەستێرەکانە شـوێن و خولگـەی هەریەکـەیان لەئاسمانـدا دەپارێزێـت. خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ﴾الواقعة/٧٥-٧٦، واتـە: سـوێندم بـە شـوێنی ئەستێرەکان، ئەو سوێندە گەر بزانن سوێندێکی زۆر گەورەیە.

لێکۆڵینەوە لە شوێنی ئەستێرەکان و ئایەتە خواییەکان لـە گەردووندا، دەبنە بەڵگەی یەکلاکەرەوە لەسەر بوونی هاوسەنگییەکی بێوێنـە لـەنێوان سەرجەمیاندا. جیاوازی لە قـەبارەی ئـەم ئەسـتێرە و هەسارانە و چڕیی و پێکهاتە گازی و کانزاییەکانیان و بارستەو وزە و خێراییان لە خولگەکانیاندا و دووریـیـە زۆرەکـانی نێوانیـان، بەڕاسـتی جیاوازییەکـە دەچـێتە خانـەی موعجیزەوە.

# دەلاقەی ئاسمانی

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ﴾الرحمن/٣٥، واتە: (ئەم ئایەتە باس لەوە دەکات کە ئەگەر لە سنوور دەرچوون) ئەوا بڵێسەی ئاگر و مسی تواوەیان بۆ دەنێرین، ئیتر شکست دەخۆن و سەرکەوتوو نابن.

هەروەها خوای گەورە لەسەر زمانی پەری (الجن) دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾الجن/٨، واتە: ئێمە بەرەو ئاسمـان کشـاین و هەسـت و هۆشمـان خستەکار، (سـەرنجماندا) پـڕە لە پاسەوانی بەتوانا و بێشوومار، و شوهبیش.

زاناکـان دۆزیانـەوە کـە بۆشـایی ئاسمـان بارگاوییـە بـە گـەردە بـەئایۆنبووەکان (پلازمـا)، هـەروەها پشـتێنەیەکی گـەورە لـە تیشـکی مەترسیداریان ئاشکرا کردووە (شواظ من نار) کە لە دوو چیندا دەوری گۆی زەوی داوە و لەزانستدا بە "پشتێنەی ڤان ئەلن" ناسراوە... ئەم تیشکانە پێکهاتوون لە ئەلیکترۆن و پۆزیترۆنی بارگاوی کە بەخێراییەکی زۆر گـەورە دەجولێن، ئەمە جگە لە تیشکەکانی گاما و تیشکە گەردوونییەکان.

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا تێبینی کرا هەوا بەئایۆن دەبێت، گەرچی جیاکراوە بێت و لەنێو دەفری داخراویشدا بێـت. تێبـینی ئـەوەش کـرا ئـەم دیاردەیە (بەئایۆنبوونی هەوا) هـەر ڕوودەدات تەنانـەت ئەگـەر ئـەو دەفـرە داخراوانە بە چینێکی ئەستوری قورقوشمیش داپۆشرابن کـە تیشـکی گامـا

نایانبڕن. لێرەدا زانایان گەیشتنە ئەو بڕوایەی دەبێت تیشکێکی تر ئەو کارە بکات کە لە بۆشاییەکانی گەردوونەوە بەرەو زەوی دێت، ئەو تیشکە ناونرا " تیشکی گەردوونی " کە بەشێوەیەکی بەردەوام لەبۆشایی دەرەوە دەگاتە زەوی. ئەم تیشکە وزەیەکی زۆر مەزنی هەیە بەشێوەیەك کە تێکڕای وزەی تیشکی گەردوونی نزیکەی (١٠هەزار ملیۆن) ئەلیکترۆن ڤۆڵتە بۆ هەر تاکە تەنۆلکەیەك، ئەم تیشکە پێکدێت لە پرۆتۆن (بەرێژەی٩١,٥٪) و تەنۆلکەکانی ئەلفا (بەرێژەی ٧,٨٪) کە هەموو تەنەکان دەبڕێت گەرچی ئەستوری و سروشتیان هەرچەندێك و هەرچۆنێك بێت.

زانایان (کلارك، هارلۆ، دیمۆند، هیل، فزیل) کە گەورەترین زانایانی ئەم سەردەمەن، ئەوەیان دۆزییەوە کە (پاسەوانی بێتوانا و بێشومار و شوهبیش) ﴿حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾، واتە چەندین شوهب و نەیزەکی دەرچوو لە ئاسمانەوە... کۆمەڵێکی زۆر لە زانایانی گەردوون و فیزیای گەردوونی نزیکە لەسەر ئەستەمیەتی بڕین و تێپەڕینی ئاسمانەکان ڕێکبکەون، لەبەر ئەم هۆیانە:

١. توندیی و بڕی تیشك لە پشتێنەی ڤان ئەلندا کە دەوری زەوی داوە لە بەرزاییە جیاوازەکاندا، زۆر بەهێز و مەترسیدارن، بەشێوەیەك کە تێپەڕبوونی تەنێك بەو بەربەستە تیشکییەدا و کاریگەرنەبوونی بەتیشکە مەترسیدارەکانی زۆر ئەستەمە، بە هەزاران جار مەترسیدارترن لەو تیشکانەی لەئەنجامی تەقینەوە ناوەکییەکانەوە دەردەچن.

٢. بەهۆی وزە و توندی تیشکە گەردوونییەکان لەبەرزاییە زۆرەکانی ئاسماندا کە مەترسی گەورە لەسەر تەنە زیندووەکان دروستدەکەن.

٣. مەترسی کاریگەری ئەو شێواندنەی بە بەردەوام ڕوودەدات لە بەرزاییەکانی بەرگەهەوادا کاریگەری هەر دەمێنێت، چونکە چڕی هەوا زۆر

کەمە و ناتوانێت هەڵیانمژێت یان پێچەوانەیان بکاتەوە.

٤. ئەو شوهب و نەیزەکانەی لێرەولەوێ لـە ئەستێرە و هەسارەکانەوە دەردەچن، چەند بەرزبینەوە بۆ سەرەوە ئەوەندەش ڕێژەیان چەند جار دەبێت... زاناکان مەترسی نەیزەکەکان بە گرنگترین مەترسییەکان دادەنێن کـە دەگونجێت ڕووبەڕووی کەشتییە ئاسمانییـەکان ببنـەوە و تێکیـان بشکێنن، چونکە لە ناوچە بەرزەکانی بۆشایی ئاسماندا نەیزەکی پەرتەوازە و بلاو هەن کە هەندێکیان بینراون و هەندێکی تریشیان نـەبینراون و بـریتین لە بارستەی گەورە لـە ئاسن و ماددەی کانزایی تـر کـە کێشیان دەگاتـە هەزاران تەن.

٥. چەند بەرەو بۆشایی بەرزبینەوە، توندی تیشکی سەروونەوشـەیی مەترسییەکەی زیاددەکات.

پشتێنەی "ڤان ئەلن" هەردوو زانا "فیرنوف"ی ڕوسی و "ڤان ئـەلن"ی ئەمریکی دۆزیانەوە. ڕوونیان کردەوە کە زەوی لە ناوچەی هێڵی یەکسانیدا بـە ســێ چــین دەورەدراوە و تەنۆلکــە بارگاوییــەکان لــە تیشــکە گەردوونییەکاندا بەهۆی بواری موگناتیسی زەوی (کە بـوارێکی نارێکوپێکە و لە جەمسەرەکاندا چڕترە) کۆنترۆڵ دەکرێن... کاتێك تەنۆلکەکان دەگەنە ئەم پشتێنەیە ناچاری دوو جۆر جووڵە دەبن:

١. بەدەوری خۆیاندا خول دەخۆن.

٢. بەدرێژایی ئەو هێڵانە خول دەخۆن.

بـەڵام زاناکـان ئـەوەیان دۆزیوەتـەوە چـەند ناوچـەیەك هـەن بـەتاڵن لە تەنۆلکـە کوشـندەکان کـە وزەیـەکی زۆر بـەرزیان هەیـە: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴾المؤمنـون/١٧، واتـە: بەڕاسـتی ئێمە لە ڕاسەرتانەوە حەوت چین ئاسمانمان دروستکردووە و ئێمـە هـەرگیز

لە دروستکراوان غافلْ و بێئاگا نین.

ئـەم ناوچـەیە کـە تێپـەڕین پیایـدا ڕێپێـدراوە و دەلاقـەی ئاسمانییـە، لەسـەر شـاری (قـودس)ەوەیـە و چـوونە ژوورەوە لێیـەوە بـەرەو بۆشـایی دەرەوە گونجاو و ئاساییە بەبێ توشـبوون بـە هـەر گرفتێـك، ئـەم كـارەش لەڕێی مانگە دەستكردەكانەوە دەبێت كە ئاسمـان دەپشـكنن و پاشـان لـە ناوچـەیەكی سـەنتەریەوە كـە دەكەوێتـە سـەرو قودسـەوە بەرزدەبنـەوە، چونكە ئاسانترینی ناوچەكانە بۆ دەرچوون بەرەو بۆشایی ئاسمان.

بەرەنجامـــە زانســـتییە نوێیـــەكان دوپاتیـــان كردووەتـــەوە مانگـــە دەســـتكردەكان بەســـەر شـــاری قودســـدا دەســـوڕێنەوە و پاشـــان لێیـــەوە دەردەچـن، ئەمـەش دڵنیـایی ئـەو موعجیزەیـەی پێغەمبـەری مـەزن (ﷺ) دەدات لە ڕووداوی شەوڕەوی و بڵندبوونەوەدا كـە لـە مەككـەوە بـۆ قـودس ڕۆیشت، پاشـان لـە مزگـەوتی ئەقسـاوە كـە لـە قودسـدایە بـەرەو ئاسمـان بەرزكرایەوە.

شایانی ئاماژە بۆكردنـە خـاڵی سـەرەتا كـە بـڕی تەنۆلكـە كوشـندەكان دەست بەكەمبوون دەكەن دیسانەوە دەكەوێتـە سـەرو شـاری قـودس و بـە هێڵێكی لار ڕووەو سەرەوەی ناوچـەی جەمسـەری بـاكور درێژدەبێتـەوە... هیچ كەشتییەكی ئاسمـانی ناتوانێـت بـەهێڵێكی ڕاسـت بەرزبێتـەوە، بـەڵكو دەبێت لەكاتی بەرزبوونەوەیدا بـەدەوری خۆیـدا بسـوڕێتەوە. ئەمـەش ئـەو ڕاسـتییەیە كـە قورئـانی پـیرۆز ئامـاژەی پێـدەدات و دەفـەرموێت: ﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴾الحجـــر/١٤، واتـــە: (ئـــەو بێباوەڕانە) ئەگەر دەروازەیەكمان لە ئاسمانەوە بۆ بكردنایەتەوە تـا پیایـدا سەربكەون و تێپەڕ بن (عروج بكەن) و (نهێنی دروستكراوانی ئێمـە ببینـن، هەر باوەڕ ناهێنن).

# ئەستێرە کونکارەکە

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ① وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ② ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ﴾الطارق/١-٣، واتە: سوێند بە ئاسمان و بە (طارق)، تۆ چوزانی (طارق) چییە؟ ئەستێرە کونکەرەیە تیشکی تاریکی دەبڕێت.

پـەروەردگار سـوێند بـە ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾ دەخـوات... هـەر کـەس لەسەرەتادا گوێی لەم سوێندە بێت نازانێت مەبەست لە (الطـارق) چییە، بـەڵام لەدواییـدا خـوای گـەورە ڕوونیدەکاتـەوە بـەوەی کـە ئەسـتێرە کونکەرەکەیە (النجم الثاقب).

لێرەدا پرسیار ئەمەیە کە ئایا چۆن دەبێت ئەستێرەیەك (طـارق) و (ثاقب)یش بێت؟ ئایا شرۆڤەیەکی زانستی بۆ ئەم حاڵەتە هەیە؟ ڕاڤـەکاران ڕاڤەی تیشکی ئەستێرەکەیان کردووە کە کونکەرە و تێپەڕبووە، بەڵام سیفەتی (طارق) بە دەگمەن باسی لێوەکراوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ﴾النجم/١، واتە: سوێند بەو ئەستێرەیەی لە شوێنی خۆی دەترازێت و بەخێرایی بەردەبێتەوە.

ئەم سـوێندەیان تایبەتـە بە دیاردەیـەکی تـری گـەردوونی کە ئـەویش دیـاردەی تـرازان و بەربوونـەوەی ئەسـتێرەیە. لێـرەدا پێویسـتە جیـاوازی بکـەین لـەنێوان ئـەم دیاردەیـە و دیـاردەی کەوتنـەخوارەوەی ڕۆژانـەی

شوهبەکان. شوهب ڕۆژانە دێتـە نێـو بەرگەهـەوا و لێکخشـاندنی بـە هـەوای کەش دەبێتەهۆی بەرزبوونەوەی پلەگەرمییەکەی و لەپاشان سوتانی، ئەمە وێڕای ئـەوەی هەنـدێك لـە شـوهبەکان دەکەونـە سـەر زەوی. خـوای مـەزن سـوێندی بـە شـوهبە کـەوتووەخوارەوەکان بـۆ سـەر زەوی نـەخواردووە، سەرەڕای ئـەوەش کـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا زیـاتر لـە جێگایەکدا ئامـاژەی پێدراوە.

بارستایی ئەستێرە نیوترۆنییەکان زیـاترن لـە بارسـتایی خـۆر بـەنزیکی (١,٤) هێند. لەسـەرەتادا کـە ئەسـتێرەکە دەسـت بەچـوونەوەیەك دەکـات بەســـەرخۆیدا، بـــەخێرایی دێتەوەیـــەك و پەســـتان لەســـەر گـــەردەکانی ماددەکـــەی پتردەبێـــت، بەمـــەش گـــەردەکانی تێکدەشـــکێن و شـــلگازی ئەلیکترۆنی (المائع الألكتروني) دروستدەبێت و ئەسـتورییەکەی زیاددەکـات و توانـای بەرگـەگرتنی ئـەو پەسـتانەی نامێنێـت کـە بـەهۆی قورسـایی ئەستێرەکە و کێشکردنیەوە بەرهەم دێت. ئەنجامی ئەمـەش هەرەسـهێنانی هێـزی کێشـکردنی ئەسـتێرەکەیە (شـلگازە ئەلیکترۆنیەکـە) کـە لەلایـەن گەردەکـەوە تێکشـکاوە و هەرەسـهێنانی ئەسـتێرەی زەبـەلاحی سـووریش بەسەرخۆیدا بەردەوام دەبێت. ئەلیکترۆنەکان دەلکێن بـە پرۆتۆنەکانـەوە و پاشان لەگەڵیدا یەکدەگرن و نیۆترۆنی نوێ دروستدەبێت.

ئەمــە بــەردەوام دەبێــت (بەرامبــەر هێــزی قورســی ئەســتێرەکە) و لەکۆتاییـــدا ســـەرجەم ئەلیکترۆنـــەکان لەگـــەڵ پرۆتۆنـــەکان یەکـــدەگرن و ئەودەمە ئەستێرەکە بریتی دەبێـت لـە نیـوترۆنی پەسـتێوراو لەسـەریەکتر، بـــەبێ بـــوونی هـــیچ بۆشـــاییەك، بەشـــێوەیەك چـــڕی ئەســـتێرەکە دەگاتـــە ژمارەیەکی پێوانەیی ئەوتۆ کە وێناکردنی زۆر ئەستەم دەبێت.

بەمجۆرە ئەستێرەی زەبەلاحی سوور دێتەوەیەك تا پێكهێنانی ئەو تەنەی پێیدەوترێت "ئەستێرەی نیوترۆنی".

ئەستێرەی نیوترۆنی چڕییەكەی زۆرە، بەجۆرێك كە قەبارەی تەنها تۆپێكی پیّ لەماددەی ئەم ئەستێرەیە كێشەكەی دەگاتە (٥٠ هەزار بلیۆن) تەن. ئەگەر ئەم تۆپە بخرێتە سەر ڕووی زەوی یان هەر تەنێكی ئاسمانی تر، ڕووەكەی بەرگەی ئەو كێشە زۆر گەورەیە ناگرێت و تۆپەكە بەنێو زەوی یان تەنە ئاسمانیەكەدا تێپەڕ دەبێت و لەدوای خۆیەوە كونێك بەجێدەهێڵێت كە لەگەڵ قەبارەی تۆپەكەدا هاوڕێژە دەبێت.

چیرۆكی دۆزینەوەی ئەستێرەی نیۆترۆنی چیرۆكێكی سەرنجڕاكێشە. لەساڵی (١٩٦٨ز)دا كچە قوتابیەكی ئەمریكی چەند ئاماژەیەكی بێتەلی بەهۆی ئامێرێكی نوێوە وەرگرت (ئەو ئامێرە پێیدەوترێت تەلەسكۆبی بێتەل یان ڕادیۆیی–Radio telescope) و ئاماژە بێتەلەكان لە قولایی ئاسمان و دووریی سەدان ساڵی ڕووناكییەوە وەردەگرێت و تۆماریان دەكات.

لە سەرەتای حەفتاكانی سەدەی بیستەمدا گەردووناسەكان توانییان چاودێری چەندین ئەستێرە بكەن كە سەرجەمیان خاوەن سیفەتی ناردنی ئاماژەی بێتەلی ڕێكوپێكن. ئاماژەكان بە پچرپچری دەگەن: (لە شێوەی: بیب...بیب...بیب). هەر ئاماژەیەك چەند بەشێكی چركەیەك دەخایەنێت و هەر چركەیەك یان زیاتر دووپات دەبنەوە.

ئەوەی ناوی ئەم ئەستێرانەی ناوە (كە ئاماژەی بێتەلی ڕێكوپێك دەردەكەن) بەناوی ئەستێرە پرتەدارەكان بە ئەستێرەی (الطارق الثاقب) ئایەتێكە لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز كە تیایدا خوای گەورە سوێندی پێدەخوات: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ۝١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ۝٢ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ﴾.

(الطـارق) تـەنێکی ئاسمانییـە و دوو سـیفەتی تـری هەیـە، ئـەوانیش ئەسـتێرەیی و کونکارییـە، خۆئەگـەر لەسـەر بنـەمای ئـەم خاسـیەتانە بەراوردی تەنە ئاسمانییەکان بکەین، دەبینین تەنها ئەستێرەی نیۆترۆنییـە ئـەم سـیفەتانەی تێدایـە، ئەسـتێرەو کونکـار و (طـارق)، پرتـە و لێـدانی ڕێکوپێکیان هەیە. (الطارق) لێدانی ڕێکوپێکی پچڕپچڕ دەردەکات (تك... تك...) بەتـەواوی وێکچووی ئـەو داتایانەیـە کـە بێتەلەکـە گوێزاویەتیـەوە بۆمان و سەرچاوەکەی ئەستێرەی نیوترۆنییە.

زاناکـان گەیشـتوونەتە ئـەو ڕاسـتییەی کـە ئەسـتێرەی نیـوترۆنی لەنزیکبوونەوەی لەدایکبوونیدا پرتەی خێرای هەیـە، بـەهۆی وزەی خێرایـی سوڕانەوەکەیەوە. ئەستێرەی نیوترۆنی بەتەمەن ئاماژەی هێواش و هێدیی هەیـە و مـاوەی نێـوان ئاماژەیـەك بـۆ ئاماژەیـەکی تـر درێـژترە، ئەمـەش لەکاتێکدایـە کـە ڕێـژەی وزەکـەی دادەبـەزێت و خێرایـی سوڕانەوەکەشـی کەمدەکات.

پاکوبێگـەردی بـۆ پـەروەردگاری مـەزن کاتێـك ئـەم ئەسـتێرەیەی بـە کونکەر (الثاقب) وەسف کردووە و سوێندی پێخواردووە.

لە مەزنی سوێندەکەوە درکی گەورەیی سـوێندپێخوراوەکەش دەکـەین، چڕیی ئەستێرەی نیوترۆنی کونکار بەرزترین بڕی چڕیی ناسراوی ماددەیە و کێشەکەشی لە کێشی گۆی زەوی زۆر زیاترە (وێڕای بچوکی قەبارەکـەی). ئەم ئەستێرەیە، ئەستێرەیەکی کونکارە. کاتێك ئەم ئەستێرەیە لەسەر هەر تەنێکی ئاسمانی دابنرێت یاخود تەنها بەریبکەوێت، ئەو تەنـە لەبەردەمیـدا خۆی ناگرێت، تەنانەت خۆریش. هۆیەکەشـی ئـەو چـڕییە زۆرەیـە کـە ئـەم ئەستێرە نیوترۆنییە هەیەتی.

ژمارەی ئەستێرە نیوترۆنییەکان لە گەلەستێرەکەماندا (گەلەستێرەی ڕێی کاکێشان) بەسەد هەزار ئەستێرە دادەنرێت. ئاشکرایە ملیۆنان گەلەستێرەی تریش بە سەدان هەزار ئەستێرەی نیوترۆنی لێدەر و کونکاری تێدایە و ئاسمان پڕیەتی لەم ئەستێرانە.

پەروەردگار هەر لەدوای ئەو ئایەتانەوە دەفەرموێت: ﴿إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ﴾الطارق/٤، واتە: "(سوێند بەوانە) هەر هەموو کەسێك چاودێری هەیە". هەموو کەسێك چاودێری دەکرێت، تاکو لە مەترسی ئەوانە بپارێزرێت.

# دیاردەی خۆر گیران و مانگ گیران

قورئانی پیرۆز پتر لە جیگایەکدا لـەبارەی دیـاردەی خـۆر گـیران دواوە، لەوانـە: خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا﴾ الفرقـان/٤٥-٤٦، واتـە: ئایـا نابینیـت چـۆن پـەروەردگارت سـێبەر درێـژ دەکاتەوە، ئەگەر بیویستایە جێگیری دەکرد، پاشان خۆریشمان کردووە بە بەڵگە و نیشانە لەسەر سێبەر، لـەوەودوا بەشـێنەیی ئـەو سـێبەرە بـۆ لای خۆمان دەگێڕینەوە و دەیگرینەوە.

یـان دەفـەرموێت: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ التکـویر/١، واتـە: کاتێـك خـۆر دەپێچرێتەوە و ڕووناکی نامێنێت.

لـەو ئایەتـە پیرۆزانـەدا ئاماژەیـەکی زانسـتی هەیـە کـە پەیوەندییـەکی پتەوی کردووە لەنێوان دیاردەی سێبەر و خۆردا، بەجۆرێك کە خۆر بووەتە بەڵگە لەسەر سێبەر و سێبەریش بەڵگە لەسەر خۆر.

زانایـانی گەردووونناسـی دەڵـێن: کاتێـك مـانگ دەکەوێتـە نێـوان خـۆر و زەوییەوە و هەرسێکیان لەسـەر یـەك هێڵـی ڕاسـت دەبـن، سـێبەر لەپشـت مانگەوە بۆ سەر زەوی بەشێوەی قوچـەکێك درێژدەبێتـەوە تـا کۆتـایی بـە ناوچەیەکی تاریك (ڕەش) دێت لەسـەر زەوی پانیەکـەی نزیکـی (١٠٠ میـل) دەبێـت... ئەودەمـەی خـۆرگیرانی تـەواوەتی دەبێـت ئـەو ناوچـە ڕەشـە

دەجولێت و دوورییەك دەبڕێت لە دووركەوتنیـەوە بـۆ دیارنـەمانی لـە چـوار كاتــژمێردا، زۆر بەدەگمــەن خــۆرگیرانی تــەواوەتی (٧,٥ خولــەك) زیـاتر بخایەنێت... لەو حاڵەتەدا كە مانگ زۆر دوور بێت لەزەوییەوە، ئـەو ناوچـە ڕەش و تاریكـەی باسـكرا ناگاتـە زەوی و بـەوەش خـۆرگیرانی تـەواوەتی ڕوونادات.

خۆرگیرانی تەواوەتی تەنها (٣٠٠ ساڵ) جارێك ڕوودەدات، بە جیـاواز لـە خۆرگیرانی كەلی (ناتەواو) كە زۆرجار ڕوودەدات.

جێی باسـە گونجـانی دوورییـەكانی نێـوان هەریەكـە لـە خـۆر و مـانگ و زەوی دەرئاسـایەكی گـەردوونی گەورەیـە، لەسـەر بنـەمای ئـەو دووریانـە دیاردە سروشتییەكان ڕوودەدەن، هەر لەسەر ئەو بنەمایانەیە ژیـان جێگیر و بەردەوامە.



دیاردەی خورگیران

# شوێنی ئەستێرەکان

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ﴾الواقعة/٧٥-٧٦، واتە: سوێندم بە شوێنی ئەستێرەکان، بێگومان ئەو سوێندە گەر بزانن سوێندێکی زۆر گەورەیە.

گەردوونناسیی سەلماندوویەتی: "قورئانی پیرۆز یەکەمین پەرتوکی جیهانە ئاماژەی بە بایەخی ئەستێرەکان دابێت وەك نیشانەگەلی ڕێنوێنی ڕێبوار لە وشکایی و دەریادا. زیاتر لەوە ئەستێرەکان گرنگترین بایەخپێدراون لەلایەن پەیمانگاکانی کەشتییەوانیەوە، گرنگترین کاری سەرقاڵانە بە کاروباری گەشت و هاتوچۆوە".

لەبەر گرنگی شوێنی ئەستێرەکانە پەروەردگاری مەزن سوێندی پێخواردوون، ئەوەش بۆ دەرخستنی بایەخ و گرنگی ئەو شوێنانە... دووریی نێوان ئەستێرەکان دەگەنە ڕادەیەك کە ئیدی خەیاڵ ناتوانێت وێنای بکات، بۆنموونە نزیکترین ئەستێرە لێمانەوە لە کۆمەڵەی خۆردا، خۆرە کە نزیکەی (١٥٠ملیۆن کیلۆمەتر) لێمانەوە دوورە.

شوێنی ئەستێرەکان واتایەکی زانستی دیکەی هەیە، بۆنموونە شوێنی زەوی بەجێگایەکی تا ئەوپەڕ ورد و نایاب دادەنرێت لەبەر ئەم هۆیانە:

یەکەم: ئەگەر زەوی دوو هێندی دووریی ئێستای لە خۆرەوە دوورتر بوایە، ئەوکاتە بڕی ئەو گەرمییەی دەگەیشتە زەوی دەبووە چارەکی ئەو

بڕەی ئێستا دەمانگاتێ، لەلایەکی تریشەوە زەوی کاتێکی زیاتری دەویست بۆ سوڕانەوەی بەدەوری خۆیدا، ئەوەش دەبووەهۆی درێژبوونی وەرزی زستان و دوابەدوای ئەوە بەستنی بوونەوەرە زیندوەکانی سەر ڕووی زەوی.

دووەم: ئەگەر زەوی لەخۆر نزیك دەبووەوە بۆ نیوەی دووریی ئێستای، ئەودەمە ئەو گەرمییەی لەخۆرەوە دەگەیشتە زەوی دەبووە چوار هێندی ئەوەی ئێستا پێمان دەگات، خێرایی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا دووئەوەندە زیادی دەکرد و وەرزەکان نەدەمان و ژیانیش لەسەر زەوی ئەستەم دەبوو.

سێیەم: لێکۆڵینەوەی شوێنی ئەستێرەکان ڕەهەندی قوڵی هەیە، تا هەنوکەش زانایان کەمدەستن لەبەردەمیدا و ناتوانن بەدوایدا بڕۆن.

ئێستا با چاوێك بخشێنین بە گەورەیی هەسارەکان و تەنەکانی کۆمەڵەی خۆردا :

١. نزیکترین تەنی گەردوونی لە زەوییەوە مانگە کە (٤٠٠ هەزار کیلۆمەتر) لەزەوییەوە دوورە.

٢. خۆر نزیکەی (١٥٠ملیۆن کیلۆمەتر) لێمانەوە دوورە، ئەم دوورییە کەمێك دەگۆڕێت، چونکە ڕێڕەوی جوڵەی زەوی بەدەوری خۆردا شێوە هێلکەییە.

٣. زوهرە و مەریخ دورییان لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر زۆر جیاوازە، نزیکبوونەوەی هەسارەی زوهرە لە زەوییەوە دەوروبەری (٢٥٠ملیۆن کیلۆمەتر) دووردەکەوێتەوە. مەریخیش بەهەمان شێوە هەموو (١٥-١٧ساڵێك) نزیکەی (٧٠ کیلۆمەتر) لە هەسارەی زەوی نزیکدەبێتەوە.

دووریی هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر لە خۆری دایکەوە بەمجۆرەیە:

عەتارد ٨٥ مليـۆن كيلۆمـەتر لـە خـۆرەوە دوورە – زوهـرە ١٠٨ مليـۆن كيلۆمەتر – زەوى ١٥٠مليۆن كيلۆمەتر – مەريخ ٢٢٨ مليۆن كيلۆمەتر —— موشـتەرى ٧٧٤ مليـۆن كيلۆمــەتر – زوحــەل ١,٤١٨مليــار كيلۆمــەتر – ئۆرانۆس ٢,٨٥٤ مليۆن كيلۆمەتر – نيپتۆن ٤,٤٧٢ مليۆن كيلۆمەتر.

ڕەنگە ئەم دووريانە بۆ خوێنەر خەياڵى بن، جا ئەوە دووريى نێوان تاكە خێـزانێكن كــە لــە بۆشــايى گەردوونــدا لــەدەورى يــەك دايــك (خــۆر) كۆبوونەتــەوە. لەڕاسـتيدا بـە بـەراوردى دووريــى نێـوان خـۆر و كۆمەڵـە خۆريەكانى ترەوە، ئەم دووريانە زۆر كـەم و بچوكن گـەر بـەراورد لـەنێوان خۆرى خۆمان و خۆرەكانى ديكەدا بكەين، ئەوكاتە هيچ مانايەك بۆ مليۆن و مليـاران كيلۆمــەتر نامێنێتــەوە و ناچـارى بـەكارهێنانى پێـوەرى "سـاڵى ڕووناكى" دەبين. ساڵى ڕوونـاكيش ئـەو دوورييەيـە كـە ڕوونـاكى لـەماوەى سـاڵێكدا دەيبڕێـت و يەكسـانە بـە ٩,٤٦٠,٨٠٠,٠٠٠,٠٠٠ نـۆ تريلـيۆن و چـوار سەدو شەست مليار و هەشت سەد مليۆن كيلۆمەتر.

نزيكترين ئەستێرە لەخۆرەوە (ئەلفاسنتۆرى)ـە كە چوار ساڵى ڕوونـاكى و سێيەكى ساڵێك لێمانەوە دوورە. ئەسـتێرەى (گەلاوێـژ) زيـاتر لـە شـەش ساڵى ڕووناكى دوورە. ئەمە لەكاتێكدا كە ئەستێرەى تر هـەن بـە سـەدان و هەزاران و مليۆنان ساڵى ڕووناكى لێمانەوە دوورن.

خوێنەرى بەڕێز! ئايـا ئێسـتا لەگـەڵ ئـەوەدا نييـت كـە ئـەوەى خـواى گەورە سوێندى پێدەخوات (شوێنى ئەستێرەكان) بەڕاستى سـوێندێكى زۆر گەورەيە.

زانـاى گـەردوونى "جـەيمز جێنــز" دەڵێــت: "لێكۆڵينـەوە لـە شـوێنى ئەستێرەكان، كليلى جوانترين ديمەنمان دەداتێ كە چاوى مـرۆڤ بينيويـەتى

یان دەیبینێت، وامان لێدەکات تەماشای ئاسمانی سەرنجڕاکێش بکەین و لەو مانایانە تێبگەین کە پێشتر تێی نەگەیشتووین".

ئێمە دەپرسین: کێ هەواڵی نهێنی دووریی ئەستێرەکان و هەقیقەتی شوێنی ئەو ئەستێرانەی بە محمد (ﷺ) داوە؟ بێگومان ئەوە وەحیی خواییە، قورئانی پیرۆز.

## هەسارەکان

خـــوای پـــەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ﴾الصافات/٦، واتە: بێگومان ئێمە ئاسمانی دونیامان بە جوانی و ڕۆشنی هەسارەکان ڕازاندووەتەوە.



زانستی نوێ سەلماندوویەتی: "هەسارە گەڕۆکەکان تەنی ئاسمانی ناکڵپەسەندون، جگە لەخۆر، ئەو هەسارانە بڕی گەورەی بەرد و کانزایـــان تێدایـــە و هەنـــدێکیان بەرگەهەوایشیان هەیە. هەسارەکان ڕووناکی خۆر دەدەنەوە، هەروەك ئاوێنە، بەڵام بەپلەی جیاواز، ئەوەش بەندە لەسەر سروشتی ڕووەکانیان و پێکهاتەی بەرگە هەواکانیان ".

# شـــوهـــب

خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَـٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ۝٨ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَـٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا﴾ الجن/٨-٩، واتە: ئێمەش (واتە پەرییەکان) بەڕاستی بەرەو ئاسمــان کشــاین و هەســت و هۆشمــان خستەکار، ســەرنجماندا پــڕە لــە پاسەوانی بەتوانا و بێشومار، نەیزەکیش بە هــەموو لایەکدا دەکشـا، ئێمـە جـاران لەهەنـدێك شـوێنی ئاسمانـدا خۆمـان حەشـار دەدا بـۆ گـوێگرتن و دەنگوبـاس بیســتن، بـەڵام ئێسـتا ئـەوەی بیـەوێت گـوێ بگرێـت یەکســەر نەیزەکێکی بۆ ئامادەیە و بۆی دەهاوێژرێت.

زاناکان دەڵێن: " نەیزەك تەنی ئاسمانین قەبارەی جیاوازیـان هەیـە کـە بەخێرایی (٢٢٥٠کیلۆمـەتر/چرکە بـەرەو زەوی دێـن. لـە شەویشـدا بـەهۆی لێکخشــاندنیان لەگــەڵ گــەردەکانی بەرگەهــەوای زەوی بــە درەوشــاوەیی دەبینرێن". هـەرکاتێك هـەمووی سـوتا بـە شـوهب ناودەبرێـت و کـاتێکیش بەشێکی مایەوە و کەوتە سەر زەوی ئەوە نەیزەکی پێدەوترێت.

# ئەستێرەکلکدارەکان ( المذنبات )

خـــــوای پــــــەروەردگار دەفــــــەرموێت: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ١٥ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ﴾التكـوير/١٥-١٦، واتـە: سـوێند بـەو ئەسـتێرانەی پـەنهان دەبـن و لەچاو وندەبن، یاخود بەهۆی سوڕانەوەی زەوی و خۆیانـەوە ونـدەبن، بـەو هەسارانەی کە پەنادەگرن و دیارنامێنن.

خوای مەزن سوێند بە هەسارە خۆشارەوە لەچاوەکان دەخوات، یـاخود ئـەوەی لـە زانسـتی گەردوونناسـیدا پێیـدەوترێت کلکـدارەکان (المـذنبات)، هەرئەوەیە قورئانی پیرۆز بـە ﴿بِٱلۡخُنَّسِ﴾ ئامـاژەی پێـدەدات، کـە بەڕاسـتی نزیکترین وەسفە بۆ کلکدارەکان.

ڕووی ئیعجازی زانستی لە دوو ئایەتەکەی پێشوودا بەمجۆرەیە:

کلکـدارەکان لـە ئەنـدامانی کۆمەڵـەی خـۆرن، ڕێڕەوەکانیـان بـەدەوری خۆردا درێژکۆلەیە، هەندێکیان بە بۆشاییدا دەکشێن بۆ دوورییـەکی زۆر کـە دەیان ساڵ دەخایەنێت تـاکو سـوڕێك تـەواو بکـەن، بـەوەش ڕێڕەوەکـەیان دوور دەبێت لـە خـۆر بەڕادەیـەك کـە بەتـەواوی لـە بینینـەکان دووردەبـن، هەروەك ئەوەی دەیان ساڵ ون ببن و لەپاشان بگەڕێنەوە نزیك خۆر.

" کلکداری (هالی) بەناوبانگترینی کلکدارەکانە و هەموو (٧٦-٧٩ساڵ) جارێك دەگەڕێتـەوە و پاشـان دووبـارە ئـەو ماوەیـە ونـدەبێت و لـە فـەزای گەردوونیدا دیارنامێنێت".

نهێنی ئیعجازی قورئانی پیرۆز لەوەدایە کە کلکدارەکانی بە "خُـنَّس" و "الجَوارِ الکُنَّس" ناوبردووە کە دواتر زانایانی گەردووناس دروسـتی و وردی وەسفەکە و لێکچواندنەکەیان بۆ دەرکەوت.

**یـەکێکی تـر لـە ئەگـەرەکانی مانـای ئـەو دوو ئایەتـەی پێشـوو ئـەم لێکدانەوەیەیە:**

لـەم گەردوونـەدا تـەنی گـەورەی وەهـا هـەن کـە بـە کونـە ڕەشـەکان ناسراون، چڕیی مـاددەی ئـەم کونەڕەشـانە دەگاتـە (٢٥٠ هـەزار تـۆن) لـە هەریـەك سـانتیمەتر سـێجایەکدا. ئـەم کونەڕەشـانە هێزێکـی کێشـکردنی ئێجگـار گـەورەیان هەیـە و هــەموو ئـەو تەنانـەی لێیـان نزیـك دەبنـەوە دەمودەست هەڵی دەلوشن، تەنانەت ڕووناکیش کێش دەکەن!

ئەو تەنانە تاریکن و نابینرێن، ئەوەش وەهای کردبوو زانایـان لـەبوون و نەبونیان گومانیان هـەبێت، تـاکو لـەم دواییانـەدا بـوونی ئـەو کونەڕەشـانە سەلمێنرا و یەکلایی کرایەوە و هیچ گومانێك لە بوونیان نەماوە.

وەك ئاماژەی پێدرا لـە ئایەتەکـەدا خـوای گـەورە سـوێند بـە (الخُـنس) دەخـوات کـە لـەزمانی عەرەبیـدا بـە شـتێکی نادیـار و شـاراوە دەوترێـت، (الکُـنَّس)یـش بــە مانــای ڕووپێـوکردن و مــاڵین دێـت. لەڕاسـتیدا ئــەو کونەڕەشانە لەکاتی جوڵەیاندا هەرچییەك بێتە بـەردەمیان و بچێتە بـواری کێشکردنیانەوە، هەڵی دەلوشـن و بـەرەو خۆیـان کێشـی دەکـەن، ئـەوەش مانای ڕامالینی شتەکان دەگەیەنێت.

زانایـــەکی ئـــەمریکی ڕەنگـــە هـــەر قورئانیشـــی نەخوێندبێتـــەوە، کونەڕەشەکانی ناساندووە بەوەی ئەستێرەی زەبەلاحی بۆشایی گسکدەرە (وەك گسکێکی کارەبایی زەبەلاح)!!

# گەشتە بۆشایی

خـــوای پـــەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴾الـرحمن/٣٣، واتـــە: ئـــەی گـــرۆی پـــەری و ئـــادەمیزاد! ئەگـــەر دەتـــوانن بـــە بەشـــەکانی ئاسمانەکان و زەویدا دەرچن، ئەو کارە ئەنجام بدەن، دڵنیاش بن ئەو کارە بەهۆی دەزگای ماددی و توانای مەعنەوییەوە نەبێت ئەنجام نادرێت.

مرۆڤ بەدابەزینی لەسەر ڕووی مانگ گـەورەترین دەسـتکەوتی زانسـتی و کرداری بەدەستهێنا، بەهۆی داهێنان و ئـامێرە نوێیەکانـەوە تـوانی بەسـەر ڕووەکەیدا بڕوات و لە گەڕانەوەیدا نموونەی بەرد و خۆڵەکـەی لەگـەڵ خـۆی بهێنێتەوە تاکو شییان بکاتەوەو توخمەکانی بزانێت.

زانستی نوێ دەڵێت مانگ (کە مـرۆڤ بـەهۆی کەشـتی ئاسمانیـەوە پێـی گەیشـــتووە) تـــەنێکی بچـــوکی پاشـــکۆی زەوییـــە، وەك ئەوەیـــە یـــەکێك لەناوچەکانی بێت، کە (٣٨٥٠٠٠کیلۆمەتر) دەبێت، ئیتر بزانـە ئـەو دوورییـە چـــەند کەمـــە بـــە بـــەراوورد لەگـــەڵ دووری بەشـــەکانی ئاسمانـــەکان کـــە دوورییەکانی لە زەوییەوە بەهەزاران ساڵی ڕووناکی دەبن؟

خێرایـی ڕوونـاکی (٣٠٠٠٠٠ هـەزار کیلۆمـەترە لەچرکەیەکدا)، دەبێـت ڕوونـاکی لـە خولەکێکدا چـەند کیلۆمـەتر ببڕێـت، ئـەی لـە کاتژمێرێکدا... پاشان لە ڕۆژێکدا... لە مانگێکدا... لـە سـاڵێکدا؟! لـە سـاڵێکدا دوورییـەك

دەبڕێــت بــە ژمــارە ئامارییــەکانمان مەزەنــدە ناکرێــت، بــەڵکو ژمــارەی فەلەکین... خەیاڵین...

تەحــەددای بەدیهێنــەر بـۆ دەرچـوونی بـەدیهێنراوەکانی بـە بەشـەکاندا بەدوو ئاڕاستەیە:

١. ئاڕاستەی بەشەکانی ئاسمانەکان

٢. ئاڕاستەی بەشەکانی زەوی

تێبـینی دەکـەین (ئاسمـان) بـە دەسـتەواژەی (کـۆ) هـاتووە، ئـەوەش ئاماژەیەکی زانستی ورد و جوانە بـۆ بـوونی ژمارەیـەک پێکهاتـەی (بـوونی) ئاسمــانی لــەم گەردوونــە فراوانــەدا، دروســت وەک ئــەوەی دۆزینــەوە گەردوونییە نوێیەکان دەیسەلمێنن.

بەڵام زەوی بە (تاک) ناوی هاتووە، ئـەوەش ئاماژەیـە بـەوەی زەوی لـە پێکهـاتن و سـیفەتەکانیدا بەتـەواوی نایـاب و جیـاوازە لـەنێوان سـەرجەم هەسارەکانی تردا. ئەمەش کتومت وێکچووی نوێترین زانیارییەکانی زانسـتی نوێیە.

ئیعجازی ئایەتەکە لە دەستەواژەی (إلاّ بِسُلطان)دایە، بەمانای ناتوانـایی لە دەرچوون بە بەشەکانی ئاسمانەکان و زەویدا بەبوونی هێزێکی گـەورە و زۆر مەزن نەبێت... ڕەنگـە هێـزی کێشـکردنی زەوی بێـت، پێدەچێت ئـەو خێراییـە بێـت کـە پێـی دەجـوڵێین، ناشـکرێت لـەخێرایی ڕوونـاکی نزیـک ببێتەوە.

خــەڵکی وەهــا گومــان دەبــەن مــرۆڤ بــە زانســتەکەی توانیویــەتی بــە بەشــەکانی ئاسمانــدا دەربچــێت، ئــەو کــارەش بــە هــۆی (سُــلطان)ی زانستەکەیەوە ئەنجام داوە. لێرە هەڵەکـە لـە(سُلطان)ـەکەدایە، کـە وەهـا گومـان دەبـەن سـوڵتانی زانسـت بێـت، خـۆی لەڕاسـتیدا سـوڵتانی خـوای

پەروەردگارە کە لەشەوی میعراجدا پێغەمبەری (ﷺ) تێپەڕاند، چونکە هەر زاتی (الله)یە بەسەر ملکەچکردنی سوننەت و ڕێساکانی گەردووندا بەتوانا و دەسەلاتدارە.

بەو پێیە، زانستی نوێ نەیتوانیوە بگاتە ئەو هەسارە و گەلەستێرانەی بەهۆی ئامێرەکان و تەلەسکۆبە گەردوونییەکانەوە ئاشکرای کردوون، ئەمەش لە ئەستەمبوونی بەزاندنی بەشەکانی ئاسمانن.

لە لایەکی تریشەوە، بۆ مرۆڤ ئەستەمە بتوانێت بەشەکانی زەوی ببەزێنێت، لەبەر ئەم هۆیانە:

گرنگترینیان، چەند بەرەو نێو زەوی بچین پلەی گەرمی بەرزدەبێتەوە تا دەگەینە کرۆکی زەوی، لەوێدا زەوی دەبێتە دۆزەخێك کە گەرمییەکەی دەگاتە (٣٠٠٠پلەی سەدی). ئیتر کام ئامێر دەتوانێت هەموو ئەو چینانە ببەزێنێت، لەگەڵ ئەو پلە گەرمییە زۆر بەرزەدا کە سەرجەم کانزا ڕەقە ناسراوەکان دەتوێنێتەوە!

گەر بەزاندنی بەشەکانی وشکایی توێکڵی زەوی هێندە گران و ئەستەم بێت، دەبێت حاڵەکە چۆن بێت بەگوێرەی بەشی دەریایی گۆی زەوییەوە؟ لەکاتێکدا کە ڕێژەی وشکایی زەوی (٣٠٪) یە و ئەوی تری هەمووی دەریا دایپۆشیوە.

مرۆڤ نەیتوانیوە قوڵایی دەریاکان ئاشکرا بکات تەنها لە سنوورێکی تەسکدا نەبێت، ئەوەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك فاکتەر کە گرنگترینیان زیادبوونی پەستانی هەوا و ئاو لەسەر کەسی نقوم بووی نێو قوڵاییەکان، هەر (١٦کیلۆمەتر) ڕۆچوون بۆ نێو دەریا ئەوا پەستانی بە ئەندازەی (١پەستانی کەش) زیاددەکات.

یەکێکی تر لە گرفتەکان نەمانی ڕووناکییە بەپلەپەندی، بەشێوەیەك کە لەقولایی (١١٠مەتر)دا دەریا دەبێتە تاریکییەکی شەوەزەنگ ئاسا، لەو قولاییەدا پەستان لەسەر کەس و ئامێرەکان ١٢هێندەی پەستانی کەشە.

لە هەموو ئەوانەوە دەبینین کە تەحەدداکە هێشتا لەبەردەم هەموو مرۆڤایەتیدایە و تاکو ڕۆژیی دوایی بەردەوامە. ئەوەش ئیعجازێکی ئیلاهیە کە زانستی نوێ نەیتوانیوە بە (سُلطان)ی زانست و نوێترین ئامێرەکانی ڕووبەڕووی ببێتەوە.

# گــەردیلــە

خوای گەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا دەفـەرموێت: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾یونس/٦١، واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ)) تۆ بـەهیچ کارێك هەڵناستیت، هیچ بەشێك لە قورئان ناخوێنیتـەوە (کـە ئێمـە ئاگـادار نـەبین، ئێـوەش ئـەی خەڵکینـە) بـەهیچ هەڵسـوکەوتێك هەڵناسـن ئێمە شـایەت نـەبین بەسـەریەوە لەکاتێکـدا ئــەنجامی دەدەن و تیایدا ڕۆدەچـن، هـیچ شـتێکیش لە پەروەردگاری تۆ ون نابێت لە پارچـە ئەتۆمێکـەوە بگـرە لــە زەوی یان لە ئاسمانـدا، بچوکتر بێت یان گەورە تر، کە لە دۆسـیەیەکی تایبـەتی ئاشـکرادا لای ئێمـە تۆمـار نەکرابێت.



یـان دەفـەرموێت: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ﴾الزلزلة/٨-٧، واتـە: جا ئـەوەی بەقـەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێر و چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە، ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە.

لەکۆنـدا بـاوەڕ وابـوو گەردیلـە بچـوکترین شـتە، شـتێك نییـە کـێش و قەبارەی لە گەردیلە بچوکتر بێت، بەڵام زانستی نویێ سەلماندی گەردیلـەش توانای بەشکردنی هەیە.

ئەوەیە قورئانی پیرۆز بەر لەزانسـتی نـوێ باسـی کـردووە... لـەکۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سـەدەی بیسـتدا ئـەو وتەیـە سـەلمێنرا، کاتێـك زانایـان ئاشـکرایان کـرد کـە گەردیلـەی هەنـدێك مـاددەی (وەك ڕادیـۆم و یۆرانیـۆم) هـەر خـۆی بۆخـۆی بـەش دەبێـت و لێیانـەوە تەنۆلکـەی بارگـە موجەب دەردەچێت پێیانـدەوترێت (تەنۆلکـەی ئـەلفا) و تەنۆلکـەی بارگـە سالب کە پێیاندەوترێت (تەنۆلکەی دەلتا) لەگەڵ تیشـکێك کـە بـە (گامـا) ناودەبرێت.

تاهەنوکەش زانست لێکۆڵینەوەی بەردەوامە، تاکو گەیشـتە پـەرتکردنی گەردیلە، پەتکردنی دەستکرد لە ساڵی (١٩٣٩ز): هـەر دوو زانـای ئـەڵمانی (هـاهن) و (اسـتراسمان) لـە پـەیمانگای بـەرلین گەیشـتنە کـەرتکردنی گەردیلەی یۆرانیۆم بۆ دووبەشی گەورەو چەند بەشێکی تر.

ئـەم بـیردۆزەی قورئـانی پـیرۆز لەسـەدەی حەوتەمـدا لەسـەر زمـانی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار، لـە نەتەوەیـەکی نەخوێنـدەوار، کـە لـە سارادا دەژیـا و هـیچ پەیوەندییـەکی بـەمجۆرە زانیاریانـەوە نـەبوو. ئایـا نابێتـە ئیعجازێکی جوان و سەرنجڕاکێش؟!

چەندین لێکۆڵینەوە سەلماندیان هەر توخمێك لە گەردیلە پێکدێت، ئەو گەردیلانەش لە پێکهاتەیاندا سادە نین، وەك گومان دەبرێت، بەڵکو لە تەنۆلکەی بچوك پێکدێت پێیدەوترێت (پرۆتۆن)، بە دەوریشیدا تەنۆلکەی بچوك هەن کە (ئەلیکترۆنەکان)ن، ئەم ئەلیکترۆنانە لە جوڵەیەکی بەردەوام و یەکبینەدان بەدەوری ناوکی گەردیلەکەدا (کە پرۆتۆن و نیۆترۆن پێکیدێنن).

پرۆتۆن بارگەی موجەبی هەڵگرتووە و ئەلیکترۆنیش بارگەی سالب. بارستایی پرۆتۆن ١٨٤٠هێندەی بارستایی ئەلیکترۆنە، بۆیە ڕاستە بوترێت زۆرینەی بارستایی تەن لە(پرۆتۆن) پێکدێت.

لەوانەوە دەردەکەوێت کە پێکهاتەیەك هەیە بچوکتر لە گەرد (گەردیلە)، دروست وەك ئەوەی خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا لەبارەیەوە دواوە، ئەوەش بەدۆزینەوەیەکی زانستی دەژمێردرێت کە لەم دوادواییانەدا ئاشکرا کرا.

# خێرایی ڕووناکی لە بۆشاییدا

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾السـجدة/٥، واتـە: ئـەو خوایـە لـەژوور ئاسمانـەوە کاروبـاری زەوی ڕێکـدەخات و سەرپەرشـتی دەکات، لەوەودوا ڕووداوەکان و بەسەرهاتەکان و کـاروکردەوەی بەنـدەکان دەگەڕێتەوە بۆلای لە ڕۆژێکدا کە بەرامبەر هەزار ساڵە بـەو حسـابەی ئێـوە دەیکەن.

لەسـالّی (١٩٨٣ز)دا و لـەکاتی بەسـتنی کـۆنگرەی نێودەوڵـەتی پێوەرەکانـــدا خێرایـــی ڕوونـــاکی لـــە بۆشـــاییدا بـــە (٢٩٩٧٩٢,٤٥٨کیلۆمـەتر\چـرکە) دانـراو سـەلمێنرا. ئـەم زانیاریـە لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی بیسـتەمدا زانایـان پێیگەیشـتن، هـەروەك لـە ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیدا هاتووە.

گەر بگەڕێینەوە بۆ قورئانی پیرۆز دەبینین هاوکێشەیەکی وردی پێداوین دروستی ئەوە دووپات دەکاتەوە کە کۆنگرەی نێودەوڵەتی بـۆ پێوەرەکـان لەپاریس و لەسالّی (١٩٨٣ز)دا پێیگەیشت.

خاوەنی دۆزینەوەکە ئەمجارە زانایەکی موسوڵمانە و پسپۆڕی فیزیایـە، ئـەویش "د.محمـد دودح"ــە ڕاوێـژکار لـە "هیئـة الاعجـاز العلمـي". ئـەو دۆزینەوەیەشـی لـە ئایـەتی (٥)ی سـورەتی (السـجدة) هـەلێنجاوە ﴿ يُدَبِّرُ

ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾. مەبەست لە (الأمر-کاروبار) بریتییە لە کاروباری گەردوونی فیزیایی لەژیانی دونیاماندا... "عەبدوڵلای کوڕی عباس" ئەم چەمکەی باسکردووە، گێڕدراوەتەوە کە لە ڕاڤەی (الأمر)ی ئایەتەکەدا وتویەتی: "ئەوە لەدونیادا، لەبەر خێرایی تێپەڕبوونی (واتە کاروباری گەردوونی) هەزار ساڵ دەبڕێت لە ماوەی یەکێك لە ڕۆژەکانتاندا".

"أبوحیان التوحیدي"یش لە ڕاڤەی: ﴿مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾دا دەڵێت: "ساڵ لەسەر جوڵەی مانگ بوونیاتە". ئەوەش مانای ئەوەیە عەرەب لە ژماردنی کاتدا جوڵەی مانگیان کردووەتە پێوەر، دووریشیان بە کات گوزارشت لێکردووە، وەك ئەوەی بڵێن: دووریی سێ ڕۆژ. قورئانیش بە زمانی عەرەب هاتووە، فەرمویەتی: ﴿مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾.

لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی ڕابورد و گەر زانیمان: (خێرایی تەن= دووری بڕاو ÷ کاتی خایەنراو) و بەراوردکردنی هاوکێشە زانستیەکە لەگەڵ هاوکێشە قورئانیەکە:

| هاوکێشەی زانستی | هاوکێشەی قورئانی |
|---|---|
| کات | ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ ﴾ کاتی ڕۆژێکی زەوی |
| دووری | ﴿أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾ (بەکاتی مانگی)= ١٢٠٠٠سوڕی مانگ |
| خێرایی= دووری÷ کات | کاروباری گەردوونی= (هەزار ساڵی ئێوە حسابی دەکەن، واتە ١٢٠٠٠سوڕی مانگ) ÷ (کاتی ڕۆژی زەوی) |

بەدانانی ژمارەکان لە هاوکێشەکەدا:

خێرایی کاری گەردوونی (الأمر الكوني) = هەزار ساڵ لەوەی حسابی دەکەن ÷ ڕۆژێك کە حسابی دەکەن

= ١٢هەزار سوڕی مانگ ÷ (٢٤کاتژمێر × ٦٠خولەك × ٦٠چرکە)

= ١٢٠٠٠× درێژی سوڕی مانگ بەدەوری زەویدا × ٨٦٤٠٠ چرکە

= ٣٣٤٠٥٦,٨ کیلۆمەتر\چرکە

کاتێك ئەم ژمارەیەی کۆتایی لێکبدەین لە هەریەکە لە فاکتەری مانگی (المعامل الشهري) و فاکتەری ساڵانەیی (المعامل السنوي) مانگ (هەروەك د.منصور حسب النبي) پێشنیاری کردووە، دەگەینە:

٣٣٤٠٥٦,٨ × ٠,٩٢٥٢ × ٠,٩٧ = ٢٩٩٧٩٢,٥ کیلۆمەتر\ چرکە

**ئەوەش خێرایی ڕووناکییە لەبۆشاییدا.**

ئەو ژمارەیەی لە ئایەتە پیرۆزەکەوە بەدەستمان کەوت بۆ خێرایی ڕووناکی تەواو نزیکە لە ژمارە نێو دەوڵەتییەکە کە کۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ پێوەرەکان بڕیاری لەسەرداوە. ئەو ژمارەیەی لە کۆنگرەکەدا دانرا (٢٩٩٧٩٢,٤٥٨ کیلۆمەتر\چرکە) لەکاتێکدا ژمارەکە کە لە ئایەتەکەوە دەستخرا (٢٩٩٧٩٢,٥ کیلۆمەتر\چرکە)، ئەوەش بەتەواوی وێکچوون گەر ئەو هەڵە ڕێپێدراوەمان لەبەرچاوگرت کە لە لێکدانی فاکتەرەکانەوە دروستدەبن.

ئەم لێکۆڵینەوەیە بە دەرەنجامە سەرنجڕاکێشەکەیەوە خرایە بەردەستی پسپۆڕانی فیزیای زانکۆی (ملك عبدالعزيز) لە سعودیە، لەدوای توێژینەوەی وردی پسپۆڕان ڕاپۆرتی ڕاست و دروستی لێکۆڵینەوەکەیان لەڕووی زانستییەوە، پێشکەش کرد، بەهەمان شێوە لەڕووی زمان و ڕاڤەی

ئایەتەکانیشـەوە لەلایـەن زانکـۆی (أم القـری) بەشـی زمـان و تەفسـیر لـە مەککە (سعودیە) جەختی لەسەر کرایەوە.

بەوەش لێکۆڵینەوەکە لە هەموو لایەکانەوە پەسەند کرا.

قورئانی پیرۆز دروستی گرنگترین ڕێسا دووپات دەکاتەوە کە مرۆڤایەتی لە سەدەی بیستەمدا ناسـیویەتی، ئایا ئـەوە پێشـینەیەکی ئیعجازی نییـە قورئانی پیرۆز باسی لێوەکردووە؟

﴿قُلْ إِي وَرَبِّيٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ﴾یـونس/٥٣، واتـە: سـوێند بـە پـەروەردگارم بەڕاستی ئەوە هەقیقەتێکە.

# زۆریی ژمارەی خۆرەکان

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾فصلت/٣٧، واتە: لە نیشانە و بەڵگەکانی دەسەڵاتی خوای پەروەردگار شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگە، هەرگیز نەکەن سوژدە بۆ خۆر یان مانگ ببەن، بەڵکو سوژدە تەنیا بۆ ئەو خوایە ببەن کە دروستی کردوون، ئەگەر ئێوە خۆتان بە بەندەی ڕاستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن.

(ن)ی (نسوة) کە بۆ (کۆ)یە لە وشەی ﴿خَلَقَهُنَّ﴾دا ئاماژەیە بۆ زۆریی ژمارەی خۆرو مانگەکان. ئەوەش زانست سەلماندوویەتی.

لە گەردووندا چەندین کۆمەڵەی خۆر لەگەڵ هەسارەکانیاندا کە وەك خۆری خۆمان یا بچوکتر یان گەورەتریشن، هەن و دەجوڵێن. هەر هەسارەیەك مانگێك یان چەند مانگێکی پاشکۆی هەیە یاخود هەر خۆیەتی.

زانایانی فەلەکناسی ئاشکرایان کردووە کە ژمارەی خۆرەکان پترن لە دووسەد ملیۆن خۆر، ئەوە تەنها ئەو خۆرانەن کە ئاشکرا کراون، دەبێت چەندی تر هەبن و هێشتا مرۆڤ پەی پێ نەبردوون و ئاشکرای نەکردوون؟!

# کۆتایی خۆر

زانست سەلماندوویەتی لە هەر چرکەیەکدا خۆر ( ٥٠٠٠٠٠تەن) لە کێشەکەی ونـدەکات. ئەی دەبێت لە خولەکێکدا چەند ونبکات؟ لە کاتژمێرێکدا؟ لە ڕۆژێکدا؟ ئایا لەماوەی (٥٠٠٠ ملیۆن) ساڵی تەمەنیدا چەندی ونکردووە؟! با پێکەوە حسابی بکەین:

خۆر لە خولەکێکدا کێشی کەم دەکات بەبڕی:

٥٠٠٠٠٠ × ٦٠ = ٣٠٠٠٠٠٠٠ تەن

لە کاتژمێرێکدا: ٣٠٠٠٠٠٠٠ × ٦٠ = ١٨٠٠٠٠٠٠٠٠ تەن

لە ڕۆژێکدا: ١٨٠٠٠٠٠٠٠٠ × ٢٤ = ١٥٧,٦٨٠٠٠٠٠٠٠٠٠ تەن

لە ماوەی پێنج هەزار ملیۆن ساڵدا:

١٥٧٦٨٠٠٠٠٠٠٠٠٠ × ٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠ = ٧٨٨٤٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ تەن

(حەوت سەد و هەشتا و هەشت ملیۆن و چوارسەد کوادریلیۆن تۆن) (کوادریلیۆن بریتیە لە ١ کە لای ڕاستیەوە ١٥ سفر هەبێت).

زانست سەلماندوویەتی خۆر کۆتایی هەیە، ئەویش بەهۆی ئەو کەمبوونەی لە بارستەکەیدا ڕوودەدات، ئەم ڕاستیە بەڕوونی لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە: ﴿وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ﴾القیامة/٩، واتە: خۆر و مانگ کۆدەکرێنەوە و دەدرێن بەیەکدا.

بەڵام ئایا ئەو کۆکردنەوەیە کەی و چۆن دەبێت؟

﴿فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ﴾القيامة/٧-١٢، واتە: کاتێک دێت، چـاو ئەبڵـەق دەبێـت، مـانگیش دەگیرێـت و تاریـک دەبێـت (ئـەویش هەڵدەوەشێت)، (یاسای بوونەوەر تێکدەچێت) خۆر و مـانگ کۆدەکرێنـەوە و دەدرێن بەیەکدا. ئەو ڕۆژە مرۆڤ دەڵێت: (ئەی هـاوار) بـۆ کـویێ ڕابکـەم، لەکوێوە خۆم ڕزگار بکەم. نەخێر ئیتر دەربـازبوون نییـە، تـۆ دەبێـت ئـیتر لای پەروەردگارت ئامادەبیت و لەوێ ئۆقرە بگریتت (بۆ لێپرسینەوە).

زۆر ئایەتی تریش کۆتایی خۆر دەسەلمێنن:

﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ﴾التكـوير/١-٢، واتـە: کاتێـک خـۆر دەپێچـرێتەوە و ڕوونـاکی نامێنێـت، کـاتێکیش ئەسـتێرەکان (لـە خولگەی خۆیان) دەترازێن و دەدرێن بەیەکدا.

(قتادة) دەڵێت:(تکویر) لە ئایەتەکەدا واتە: ڕوونـاکی نامێنێـت. کۆتـایی ئەسـتێرەش وەک کۆتـایی خـۆر وەهایـە، چـونکە خـۆریش یەکێکـە لـە ئەسـتێرەکان: ﴿وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ﴾، واتـــە: دەکەونـــە خـــوارەوە و درەوشانەوە و ڕوونی نامێنێت و بەخێرایی لەناودەچن و پەرش دەبنەوە.

ئەم ڕاستییە زانستییانە دەربـارەی خـۆر، قورئـانی پـیرۆز بـە ڕوونـی و ئاشـکرایی باسـی لێـوەکردوون، ئایـا ئـەوە بـەس نییـە وەک بەڵگـە لەسـەر ڕاستی و دروسـتی و دوابـەدوای ئـەوەش لەسـەر ڕاسـتی و دروسـتی هـەموو ئەوەی لەقورئاندا هەیە؟

# ژیان لەسەر هەسارەکان

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِن دَابَّةٍ وَالْمَلَائِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾النحـل/٤٩، واتـە: هەرچـی لـە ئاسمانـەکان و هەرچـی لـە زەویـدا هەیـە سـوژدە بـۆ خـوای بەدیهێنـەریان دەبـەن، هـەروەها هـەموو زینـدەوەران، فریشـتەکانیش بەتایبـەت سـوژدە دەبەن بۆ خوا و خۆ بەگەورە نازانن و لە هیچ فەرمانێکی خوا لانادەن.

بێگومان فریشتەکان وشەی (دابة) نایانگرێتەوە، چونکە بەسـەر زەویـدا بە پێ ناڕۆن. وشەی (دابة) ئەو زیندەوەرانـە دەگرێتـەوە کـە ئـاو ڕەگـەزی سەرەکی پێکهاتەی ئەندامیان پێکدێنێت، ئیتر ئەو (دابة)یە هەرچـی بێـت، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِّن مَّاءٍ﴾النـور/٤٥، واتە: خوا هەموو زیندەوەرێکی (دابة) لە ئاوێکی تایبەت دروستکردووە.

هەنـدێك لـە زانایـانی گـەردوون دەڵـێن: "سـەیر نییـە هەنـدێك لـە تەنـە ئاسمانییەکان زیندەوەری لەسەر نیشتەجێ بێت، سەیر ئەوەیە بـەو جـۆرە نەبێت".

ئاژانسـی بۆشـایی ئـەمریکی (ناسـا) لـە کالیفۆرنیـا لەسـاڵی (١٩٧٠ن)دا ڕایگەیاند: ساڵی ڕابردوو نەیزەکێك لە ئوستورالیا کەوتوەتە خوارەوە ترشە ئەمینیـەکان لـە پێکهاتەیـدا هەیـە کـە بـەردی بناغـەی ماددەی ئەندامی

زیندووە، ئەوەش ئەگەری بوونی ژیان لە دەرەوەی گۆی زەوی بەهێزتر دەکات.

لەساڵی (١٩٧٤ز)دا یەکەمین پەیام بۆ شارستانییە گەردوونییەکان نێردرا، کە پەخشەکەی سێ خولەکی خایاند. ئەم نامەیە وەها نەخشە کێشرابوو کە زانیاری بنەڕەتی لەبارەی شارستانییەتی زەوی و دانیشتوانەکەی لەخۆگرتبوو.

جێی باسە ئەم کارە ڕووبەڕووی ڕەخنەگەلی زۆر بووەوە بەو پاساوەی کارەکە هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە نەک تەنها ئەو کۆمەڵەی نامەکەیان نارد.

# کات لە نێوان زانست و قورئاندا

لەچوار چێوەی چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی (کۆمەڵـەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) لە قاهیرە، کۆڕێك دەربارەی "کات لـەنێوان قورئـان و زانستدا" بەسترا، تیایدا "د.منصـور حسـب الـنبی" سـەرۆکی کۆمەڵـە و مامۆسـتای فیزیا لـە کۆلێـژی (بـەنات)ی زانکـۆی (عـین شمـس)، باسـێکی پێشکەش کرد.

سەرەتا "د.حسـب الـنبی" جـەختی لـەوە کـردەوە کـە قورئـانی پـیرۆز هەمیشە ئاسۆی زانستی نوێ لەبەردەم زانایاندا دەکاتەوە بۆ بیرکردنـەوە و تێڕامان... بەدڵنیاییەوە زانستی ڕاست و دروست دەبێتـەهۆی باوەڕهێنـانی مرۆڤەکان، هەرگیز نابێت دژایەتی لەنێوان ڕاستییە زانستییەکان و قورئانـدا ڕووبدات مەگەر زاناکە لە تیۆرەکەدا هەڵەی کردبێت یاخود موفەسیرەکە لـە تەفسیر و بۆچوونی لە ئایەتە قورئانیەکەدا دروست نەیپێکابێت.

پاشان دکتۆر هاتە سەر ئەوەی قورئـانی پـیرۆز ئامـاژەی بـە زۆرێـك لـە مەسـەلە زانسـتییەکان داوە، وەك بابـەتی بـەدیهێنانی گـەردوون، کـات و شـوێن... قورئـان ئامـاژە بـەوە دەدات خـوای گـەورە لـە شـەش ڕۆژدا گەردوونی بەدیهێناوە، ڕۆژەکانیش لای خـوا مـاوەی زەمـەنین نـەك ڕۆژ بـە ماناکەی سەر زەوی، لەبەرئەوەی کات ڕەها نییە و ڕێژەییە، ئەمەش لەگەڵ دەرەنجامەکانی زانستی نوێ و بیردۆزی ڕێژەییدا بەتەواوی دەگونجێت.

کات لە ژیانی زیندەوەران و تەنانەت نازیندووەکانیشدا نرخ و بایەخی گەورەی هەیە، هەموان گرنگی بە پێوانی کات دەدەین وەك سنووردانەرێك بۆ تەمەن. هەروەها ماددە تیشکدەرەکانی وەك ڕادیۆم و یۆرانیۆم کە بە تیشکدان هەڵدەوەشێن و دەگۆڕێن بۆ قورقوشم، هەموو تۆخمێکی تیشکدەریش کاتێکی دیاریکراوی خۆیی بۆ هەڵوەشان هەیە (ماوەی نیوەتەمەنی تایبەت بەخۆیی هەیە).

زانایان هەندێك ماددەی تیشکدەری یۆرانیۆم و کاربۆن (١٤) بۆ دیاریکردنی تەمەنی زەوی و مێژووی ژیان لەسەر زەوی بەکاردێنن، هەروەك چۆن دیاردەی کشانی گەردوون و فراوانبوونیان لە دیاریکردنی تەمەنی گەردووندا بەکارهێناوە.

"د. حسب النبی" لە تەمەنی گەردوون دوا وەك بابەتێك بۆ سەلماندنی بوونی خودا، چونکە ئەگەر گەردوون سەرەتایەکی زەمەنی هەبوو ئەوا بەدڵنیاییەوە دەبێت بەدیهێنەر و دەستپێکارێکی هەبێت (واتە خاوەن هێز و دەسەلاتێك هەبێت سەرەتای بەدیهێنانی دەستپێکردبێت)، هەر بۆیە قورئانی پیرۆز بانگەوازێکی ڕوونی ئاراستەی مرۆڤ کردووە بۆ گەڕان بەدوای چۆنیەتی دروستبوونی گەردوون و سەرەتای بەدیهێنانیدا.

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ﴾العنكبوت/٢٠، واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ با بگەڕێن بە زەویدا تەماشابکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە.

دەلالەتەکانی ئەم ئایەتە کورتدەکەینەوە لە چەند ئاماژەیەکی گرنگدا، لەوانە: گەڕان بە زەویدا ڕێمان پیشان دەدات بۆ زانینی سەرەتای بەدیهێنان، دەستەواژەی قورئان (سیروا في الارض- بگەڕێن بە زەویدا) نەك (سیروا علی الارض- بگەڕێن بەسەر زەویدا) ئاماژەی گەڕانە بە چینە

جیۆلۆجییـەکانی زەویـدا، ئـەوەش بـۆ زانـینی چـۆنیەتی دروسـتبوونی و دروسـتبوون و پەیـدابوونی مەملەکـەتی ڕووەکـی و ئـاژەڵی، بـەڵکو زانـینی سەرەتای بەدیهێنان بە سەرجەم جۆرەکانیەوە و لەوانەشدا گەردوون.

لەزۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا هاتووە خوای گەورە گـەردوونی لـە شـەش ڕۆژدا بـەدیهێناوە، وەك دەفـەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٖ﴾ق/٣٨، واتـە: بەڕاسـتی ئێمـە ئاسمانـەکان و زەوی و هەرچـی لەنێوانیانـدا هەیـە بـە شـەش ڕۆژ دروستمان کردوون، هیچ جۆرە ماندوویەتییەکیش ڕووی تێنەکردووین.

مەبەست لە (أيام) لە ئایەتەکەدا، "قۆناغەکان" یان "ماوەی زەمەنی"ن لە بەدیهێنانی گەردووندا نەك ئـەو ڕۆژانـەی ئێمـەی مـرۆڤ دەیانـژمێرین، بـە بەڵگەی ئەوەی ئامارە بە دەستەواژەی (مما تعدّون) نـەکراوە لـە هیچکام لەو ئایەتانەدا کە سەبارەت بە شەش ڕۆژی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی دەدوێـن، وەك لـەم ئایەتانـەدا ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾الحديـد/٤. هـەروەها ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا شَفِيعٍۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ٤ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يَعۡرُجُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥٓ أَلۡفَ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾السجدة/٤-٥.

ڕاڤـەکارانی قورئـان کـۆکن لەسـەر ئـەوەی شـەش ڕۆژەکـەی بـەدیهێنان دابەشکراوە بۆ سێ بەشـی یەکسـان، هـەر بەشـێك یەکسـانە بـەدوو ڕۆژ لـە ڕۆژەکانی بەدیهێنان بەمەفهومی ڕێژەیی بۆ کات.

یەكــــەم: دوو ڕۆژ بــۆ بــەدیهێنانی زەوی لــە ئاسمانــە دووكەڵییــە یەكەمییەكە، خوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ﴾فصلت/٩، واتــە: زەوی لــە دوو ڕۆژدا دروســتكردووە... یـان دەفـەرموێت: ﴿أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَا﴾الانبياء/٣٠، واتە: ئایا كافر و خوانەناسان نـابینن و بۆیـان ڕوون نەبۆتـەوە كـە ئاسمانـەكان و زەوی یەكپارچە بوون و لەوەودوا لێكمان جیاكردنەوە؟

دووەم: دوو ڕۆژ بۆ ڕێككردن (تسوية)ی حـەوت ئاسمانەكـە چین چین. بەوتـــەی خـــوایی: ﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ﴾فصـــلت/١٢، واتـــە: لـەماوەی دوو ڕۆژدا ئاسمـانی كـردە حـەوت چـین. ئەمـەش ئاماژەیـە بـۆ حاڵەتی دوكەڵی ئاسمـان: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ﴾فصلت/١١. ئەمـە دوای تەقینەوە گەورەكە بە دوو ڕۆژ.

لەكاتێكــدا دوای ئــەوە پێكهێنــانی ئاسمانــەكان دەســتی پێكــرد: ﴿فَقَضَىٰهُنَّ﴾ واتـــە: دروســـتكردن و بـەدیهێنان... حـــەوت ئاسمــان لــە ماوەیەكی دیاریكراودا بە دوو ڕۆژی تر.

سێیەم: دوو ڕۆژ بـۆ ڕێكخســتنی جیۆلۆجیـای زەوی و ڕامكردنـی بـۆ خزمـــەتی مـــرۆڤ، خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا﴾فصلت/١٠، واتە: لەسـەر ڕووكـاری زەوی كێوەكـانی دامەزراندووە. ئەمەش ئاماژەیە بەشاخە نەیزەكییەكان، لە سەرەتادا كەوتونەتە خوارەوە و لەسەر توێكڵی زەوی جێگیربوون و بەزوویی ڕەق بوون. بەبەڵگـەی: ﴿مِن فَوۡقِهَا﴾، واتـە لەسـەر ڕووەكـەی. پاشـان: ﴿وَبَٰرَكَ فِيهَا﴾، واتـە خـەیراتی

زیـادکردووه بـەوەی ئـاو و کێڵگـە و ئاژەڵـە سوودبەخشـەکانی تێـدا بـەدیهێناوە، ئەمـەش واتـە: ﴿أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا﴾ و ﴿وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا﴾، هـەموو ڕزق و ڕۆزییـەکانی تێـدا بڕیـار داوە. ڕۆزی خەڵکەکەی و بـژێوی تێـدا بـەدیهێناوە، بـەوەی ڕووبارەکـان و درەخـت و ئاژەڵـەکانی دروسـتکردووە، وەك ئامادەباشـییەکی زەوی لـە پێشـوازیکردنی مرۆڤـدا.

هەموو ئەمانەش ﴿فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ﴾ لە ماوەی چوار ڕۆژدا تا نیاز و داخوازییەکانی مـرۆڤ جێبەجێدەکات. چـوار ڕۆژی یەکسـان بـەبێ زیاد و کەم بۆ ئەو مرۆڤانەی دەپرسن.

"د.حسـب الـنبی" جـەختی لەسـەر ئـەوە کـردەوە کـە زاناکـان بـە بەکارهێنانی هەڵوەشانی تیشکی توخمی یۆرانیـۆم و گـۆڕانی بـۆ قورقوشم گەیشتونەتە ئەوەی تەمەنی بەردەکانی زەوی و نەیزەکەکان هەژمار بکەن، بۆیـان دەرکـەوتووە دروسـتبوونی تـوێکڵی زەوی (واتـە ڕەقبـوونی توێکڵەکەی) پێش (٤,٥ ملیار ساڵ) دەستی پێکـردووە، هـەر ئـەم ژمارەیە تەمەنی بەردەکانی هەسارەی مانگیشە... هەروەها لەم دواییانـەدا زاناکـان کاربۆنی تیشکدەریان بەکارهێنا بۆ دیاریکردنی تەمەنی پاشماوە ڕووەکی و ئاژەڵییەکان و مێژووی دەستپێکردنی ژیان لەسەر زەوی. کەواتە پێکهاتن و ڕەقبـوونی زەوی پـێش (٤٥٠٠ملیـۆن سـاڵ) دەسـتیپێکردووە و مـرۆڤیش میـوانێکی زۆر دواکـەوتووە بـۆ سـەر هەسـارەی زەوی، دوای ئـەوەی پەروەردگار هەموو ئەوانەی لە زەویدا هەن بۆی ڕامکراوە.

﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا﴾الإنسـان/١، واتـە: ئایا زەمانێـك بەسـەر مرۆڤـدا نـەهاتووە کـە شـتێك نـەبووبێت، ناوونیشـانی نەبووبێت؟

زانست دڵنیایی ئەوە دەدات مرۆڤ بەر لە دەیان هەزار ساڵەوە هێنراوەتە سەر زەوی، بەبێ دیاریکردنی یەکلاکەرەوانە. دەتوانین وا دابنێین پێکهاتنی جیۆلۆجی دەستپێکردووە لە داکوتینی شاخە نەیزەکەکان لەسەر توێکڵە ڕەقەکەیەوە و دەرچوونی ئاووهەوا لە ناواخنی زەوییەوە و هەروەها بەدواداهاتنی شانشینی ئاژەڵی و ڕووەکی هەتاکو دەرکەوتنی مرۆڤ، ئەمەش ماوەیەکی زەمەنی خایاندووە بە ئەندازەی (٤,٥ملیار ساڵ) کە لە قورئانی پیرۆز و سورەتی (الفصلت)دا ئاماژە بەم ماوەیە دراوە کە سێیەکی تەمەنی گەردوونە. لە کاتێکدا ڕێکخستنی جیۆلۆجی زەوی لەساتی دەستپێکردنی ڕەقبوونی توێکڵی زەوییەوە هەتاکو دەرکەوتنی مرۆڤ کاتێکی خایاندووە ئەندازەکەی (٤,٥ملیار ساڵ)ە... بۆیە دەتوانین حسابی تەمەنی گەردوون بکەین لە قورئانی پیرۆزەوە بە لێکدانی ئەم ماوە جیۆلۆجییە لە (٣) بەوپێیەی شەش ڕۆژەکەی بەدیهێنانی گەردوون دابەشن بە سێ بەشی یەکسانەوە و هەر بەشێك یەکسانە بە دوو ڕۆژ لە ڕۆژەکانی بەدیهێنان (بە لێکدانەوەیەکی ڕێژەیی بۆ کات)، لەمەوە تەمەنی گەردوون دەبێتە (١٣,٥ ملیار ساڵ).

"د.حسب النبی" ئاماژەی بەوە کردووە کە تائێستا نەگەیشتووەتە دابەشکردنی شەش قۆناغەکەی بەدیهێنانی گەردوون. هەموو لێکۆڵینەوەکان لەدەوری دیاریکردنی تەمەنی گەردوون دەسوڕێنەوە لە تەقینەوە گەورەکەوە، بەڕێگای جیاواز و بەڕای جیاوازەوە. کۆمەڵێك زانا تەمەنی گەردوون بەپێی دیاردەی کشانی گەردوون و لادانی ڕووەو سوور بە١(٠ -١٨ ملیار ساڵ) دیاریدەکەن. هەندێك زانای تر بە دوو ڕێگە ناوکیە جیاوازەکەی هەریەکە لە زانایان (فاولار) و (هابل) تەمەنی گەردوون بە (١٣ یان ١٥ ملیار ساڵ) دیاریدەکەن، ئەمڕۆش تەمەنی زەوی بە (١٣,٧ملیار)

# تـاریکی گەردوون

تیشکی خۆر کە ناڕاستەوخۆ دێت، تاکو لەسەر تەنەکانـەوە نەدرێتـەوە، ناتوانرێت ببینرێن. هەربۆیە بەهۆی بوونی گـەردەکانی هـەوا و ئـاو و تـۆز و گـەردە هەڵواسـراوەکانی هـەواوە تیشـکی خـۆر پەرشـدەبێتەوە و بـەوەش گومەزی شینی ئاسمان دەردەکەوێت، بەڵام سەرەڕای کەمبوونی زۆری ئـەو گەردانە لە بۆشایی دەرەوەی بەرگەهەوای زەویدا، لەگەڵ ئـەوەش تیشـکی خـۆر هەیـە کەچـی کەشـتییەوانەکان هـەر بـەتاریك، وەك شـەوەزەنگێکی بەردەوام، دەیبینن.

جێی سەرسوڕمانە قورئانی پیرۆز پێشینەی هەیە لە دانانی ئاسمان بە شەوێکی بەردەوام تاریك، زۆر تاریـك، وەك دەفـەرموێت: ﴿ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا﴾ النازعات/٢٧-٢٩.

لـە میانـەی مانـای ئایەتەکـەدا (ٱلسَّمَآءُ) گوزارشـت لـە تـەواوی بۆشـایی گـەردوون دەکـات، چـونکە دەقەکـە پەیوەسـتە بـە وەسـفی قۆناغـەکانی بـەدیهێنانی گـەردوون و دروسـتبوونی کۆمەڵـەی ئەسـتێرەکان و تەنـە ئاسمانییـەکان، بـەدەربڕینی (فَسَوَّىٰهَا) لەبارەیـەوە، واتـە ڕێکخسـتن پـێش کرداری فراوانبوونی گـەردوون. (رَفَعَ سَمْكَهَا) واتـە زیـاتر چـڕی و خەسـتی،

قورئان وەسفی شەوی بۆ ئاسمان داناوە، چونکە بەدڵنیاییەوە ڕاناوی (هـا) لەوشەی (لَيْلَهَا)دا بۆ (ٱلسَّمَآءُ) دەگەڕێتەوە، کەواتـە ئایەتەکە پەیوەندی بە شەوی بەردەوامی ئاسمانەوە هەیە کە تەواوی بۆشایی ئاسمان دەگرێتـەوە نەك شەوی زەوی کە کاتەکەی بـەر لـە هـەڵاتنی خـۆرە، شـەویش بەڵگـەی ڕەشی و تاریکییە.

ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: (وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا) واتـە شـەوەکەی زۆر ڕەش و تاریـك و ئەنگوستەچـاو کـردووە، ئەمــەش تــەنها بــە شـاردنەوەی تــۆزە گەردوونییەکانی نێوان هەسارە و ئەستێرە سەرەتاییەکان دەبێـت، بـەهۆی کێشـکردن و چـوونەوەیەکی ماددەکەیـەوە. هـەروەها (وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا) واتـە تیشکی خۆری بەدیارخستووە.

جێگای سەرنجە، وێڕای ئەوەی خۆر بەردەوام هەڵاتو و بریقەدار بێت لـە بۆشایی گەردووندا، کەچی شەوێکی زۆر تاریـك لەگەردووندا باڵادەسـتە کـە وەك پۆشـاکێك ســەرجەم هەســارە و ئەســتێرەکانی لــە هــەموو بــەش و لاکانیەوە داپۆشیوە، بۆیە بەتەواوی وەك کۆمەڵە خاڵێکی بریقـەدار لەسـەر باکگراوندێکی ڕەشی تۆخ دەردەکەون.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا﴾النبأ/ ١٠.

تایبەتکردنی ئەو شەوە بەردەوامە بـەوەی پۆشـاکێکە و داپۆشـینەکەی وەك سەرجەم هەسارە و ئەستێرەکانی تری گەردوون زەویـش دەگرێتـەوە، بە وشەی (لَكُم) لەو ئایەتەدا دیارە کـە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴾الفرقان/٤٧. "ئیمـام شـەوکانی" دەڵێـت: واتـە

تاریکییەکـەیتان لەبەردەکـەین و بەهۆیـەوە داتاندەپۆشـین وەك ئـەوەی پۆشاك داتاندەپۆشێت.

کەواتـە ئـەو شـەوە بـە تاریکیـە زۆرەکەیـەوە بـە بۆشـایی گەردوونـدا درێژدەبێتـەوە تـاکو هـەموو تەنـە گەردوونییـەکان داپۆشـێت، تەنانـەت خۆریش کـە سەرچـاوەی ڕووناکییـە لـە هـەموو لاکانییـەوە دایدەپۆشـێت.

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ۝١ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ۝٢ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ۝٣ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا﴾الشمس/١-٤.

(يَغْشَاهَا) واتـە داپۆشـین، ئـەوەی کـە فرمانەکـە بـە ڕانـەبردوو هـاتووە بەڵگەیە لەسەر بەردەوامی حاڵەتەکە کە داپۆشینە... ڕاناوەکە دەگەڕێتەوە بـۆ خـۆر، واتـە شـەوە ناسـراوەکە بـە بـەردەوامی و تاریکیەکـەی خـۆر دادەپۆشـێت. هـەروەها (وَضُحَاهَا) واتـە ڕووناکییەکـەی (ڕوونـاکی خـۆر). قورئـانی پـیرۆز ڕوونـاکی و تیشـکدان دەبەسـتێتەوە بـە خـۆرەوە (بـەوەی سەرچاوەی ڕووناکییە)، مانگیش ڕووناکی ڕووەو زەوی پێچەوانەدەکاتەوە.

(جَلَّاهَا) واتـە کەشـفی کـرد و ڕوونـی کـردەوە. مەبەسـت لێـرەدا ڕوونـاکی دەرچـووە لێیـەوە کـە لـەپێش بەرگەهـەواوە نـەبینراو بـووە. بەمشێوەیە قورئانی پیرۆز فرمانی شـاراوەی بەرگەهـەوا دەردەخـات لـە ئاشـکراکردن و دەرخستنی تیشکی خۆر کە لەپێش بەرگەهەوادا واتە لەبۆشایی دەرەوەدا، دەرکی پێ ناکرێت. لەبـەر نـەبوونی دەرخسـتن و ڕوونکردنـەوە، سـەرەڕای بڵاوبوونەوەی ڕووناکیش لە گەردووندا، کەچی تەنها تاریکی بوونی هەیە.

سەرەڕای جیاجیـایی دەقـەکانی قورئـانی پـیرۆز کـە وەسـفی دیـاردەی تاریکی بەربڵاوی بۆشایی گەردوون دەکەن، هەموویان جەخت لە وەسفێکی جێگیر دەکەنەوە، ئەویش ئەوەیە هەمیشە شەو ڕووناکی ڕۆژ دادەپۆشـێت.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ﴾الرعد/٣، الاعراف/٥٤. ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: ماناکەی ئەوەیە خوای گەورە شەوی داناوە کە تاریکییە، ڕۆژ دادەپۆشێت، واتە شەوی وەك بەرگی ڕۆژ دروستکردووە کە بە تاریکییەکەی ڕووناکی ڕۆژ دادەپۆشێت. کرداری (یغشی) واتە داپۆشین. دەمــی ڕانەبردووەکــەی بەڵگەیــە لەســەر بەردەوامیــەتی و بــەهێزیش دەگــەیێنێت، بــە مانــای زۆری و زیــادەڕۆیی کــە ئــەمیش بەڵگەیــە لەســەر داپۆشینی تەواوی بەرگەهەوا بە تاریکی شەو.

لەزیاتر ڕوونکردنەوەی وەسفی ئەم دیاردە شاراوەیەی تــاریکی بــەربڵاو لــە گەردوونــدا کــە خــۆر و ڕۆژ و ســەرجەم ئەســتێرە و هەســارەکانی گرتووەتــەوە، قورئــانی پــیرۆز کــرداری (تغشــیة) واتــە داپۆشــین، بــەبێ تایبــەتکردنی بــۆ ڕۆژ، دەهێنێــت تــاکو داپۆشــینی شــەوەکە بــە تاریکییــە زۆرەکەیەوە سەرجەم ئەستێرە و هەسارە و تەنە گەردوونییەکان بگرێتــەوە وەك دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾اللیل/١.

ئاژانسی بۆشایی ئەمریکی (ناسا) دەرفــەت بــە کەســانی ئاســایی دەدات بۆ گەشتی بۆشایی ئاسمــان، تــاکو دیمــەنی پــڕ ئەفســوناوی و سەراســیمای ئاسمــان ببیــنن، دیمــەنی شــەوێکی بــەردەوام ســەرەڕای هــەڵاتن و بــوونی تیشــکی خــۆر...  قورئــانی پیرۆزیــش دەرفــەتێکی بێبەرامبــەر بــە هــەموو مرۆڤێکــی ســەرزەوی دەدات بــۆ چــێژوەرگرتن لــەو دیمەنــە ئەفســوناوییەی تــاریکی گــەردوون لــە چــەند ســاتێکدا و بــەبێ مەترســی و دوودڵــی گەشــتی بۆشــایی. ئــەویش ئەوەیــە لــە ڕۆژدا و لەگــەڵ هــەڵاتنی خــۆردا چــاوەکانی لێکبنێت و دیمەنی سیحراوی تاریکی گەردوون ببینێت. لەم وەسفە جوان و درەوشــاوەیەدا بــۆ تــاریکی گــەردوون قورئــانی پــیرۆز پێشــینەی هەیــە لــە

هەواڵی توانایی گەشتی مرۆڤ بۆ بۆشایی دەرەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴾الحجـر/١٤-١٥، واتـــە: (ئـــەو بێباوەڕانـــە) ئەگـــەر دەروازەیەکمان لە ئاسمانەوە بۆ بکردنایەتەوە تا پیایدا سەربکەون و تێپەڕ ببن، ئەوە دەیانوت: بێگومان چاوبەستمان لێکراوە، یاخود ئێمە کەسانێکی جادوو لێکراوین!!

(سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا) واتـە چـاوەکانمان داخـراوە، بـە مانـا نقـوم بـووە و داپۆشراوە، یاخود ڕێی لێگیراوە و قەدەغە کراوە لـە بیـنین، ئـەو کەسـەش کە چاوەکانی لێکنابێت جگە لەتاریکی هیچی تر نابینێت.

جێی سەرسامییە قورئانی پیرۆز وەها بـاس دەکـات کـە هەسـتکردن بـە چاولێکنان و (سكرت الأبصار) لە ئاکامی تاریکی لەگەڵ بەرزبوونەوە لەسەر ڕێرەوی لولپێچی (لە کاتی ڕۆژدا) دەبێت، تاکو دڵنیایی ئەوە بدات دیمـەنی تاریکی لەسەرو بەرگەهەواوەیە. هەر لەبەرئەوەیە کرداری (ظلّوا)ی لەجیاتی (باتوا) یان (أمسوا) بەکارهێناوە، تاکو بیگەیێنێت ئـەو دیمەنـە وێنـەکراوەی قورئان پێشکەشی دەکات لـەکاتی ڕۆژدایـە، چـونکە سـێبەر تـەنها لـەڕۆژدا دەبێت.

بەر لە سەردەمی گەشتی فەزا، مرۆڤ هیچ بوونێکی لە بۆشـایی ئاسمانـدا نەبووە و شوێنی بـەردەوامی هـەر زەوی بـووە، واتـە لەسـەر ڕووی زەوی و لـەژێر پێوەنـدێکی تـەنکی بەرگەهـەوادا. بەدڵنیاییـەوە ئـەم وەسـفە درەوشاوانەی قورئانی پیرۆز بۆ تـاریکی گـەردوون گـەواهین لەسـەر ئـەوەی لەلایەن خـوای بەدیهێنـەرەوە دابـەزیوە، کـە سـەرجەم نهێنییـەکانی بـوون دەزانێت.

# پێچانەوەی ئاسمان و زەوی

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ يَوْمَ نَطْوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾ الانبياء/١٠٤، واتە: ڕۆژێك دێت ئێمە ئاسمان دەپێچینەوە، وەکو چۆن کتێبی کراوە دادەخرێت و دەپێچرێتەوە، هەروەك چۆن لەسەرەتاوە دروستمان کرد وەك ئەوکاتەی لێدەکەینەوە، ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە بێگومان ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین.

ئەم ئایەتە پیرۆزە باس لە گرنگی بابەتی سەرەتای بەدیهێنان و کۆتایهاتنی دەکات و دەیدات بە گوێ و تەسەوری مرۆڤدا کە ڕووداوێکی بەبایەخە بۆ بوونی مرۆڤ و بوونی سەرجەم گەردوون. لێرەدا مەبەست لە سەرەتای دەستپێکردنی بوون، سەرەتای دەستپێکردنی گەردوونە بە هەموو ئەو شتانەی تێیدایە، ئەوانەی بەچاوی ئاسایی دەبینرێن و ئەوانەش کە تەنانەت بە بەتواناترین تەلەسکۆب و مایکرۆسکۆبەکانیش نابینرێن و دەگونجێت لە داهاتووشدا نەبینرێن، هەروەها ئەو شتانەی بە زانستی خۆمان دەیزانین و بە لۆژیك و حسابات پێی گەیشتوین و ئەوەش کە بە زانستیشمان نایزانین و نهێنییەکن لە نهێنییەکانی بوون و بەدیهێنان.

ئەوەش کە لە ئایەتە پیرۆزەکەوە تێیدەگەین ئەوەیە: ئەم گەردوونە دوورییەکانی بە زیاتر لە (٢٠ملیۆن ساڵی ڕووناکی) مەزەندە دەکرێت و

بارستاييەكەشـــی بـــە (١٠) و لەبـــەر دەميـــدا (٥٥) ســـفر كيلـــۆگرام دەخـــەملێنرێت، لەبـەر دەسـتی توانـايی خـوادا وەك پـەڕەكانی كتێبێكـە لەبەردەم خوێنەرەكەيدا. ئـەم لێكچونەی گـەردوون بـە پـەڕەكانی كتێبێـك لێكچونێكی گەلێك جوان و وردە و پێويستە مرۆڤ هەڵوێستەی لەسەر بكـات و بيری لێبكاتەوە.

**لەئايەتە پيرۆزەكەوە چەند خاڵێكمان بۆ دەردەكەوێت:**

يەكـەم: هەرچـەند گـەردوون فـراوان بێـت و ناوەڕۆكەكـەی زيادبێـت و كێشەكەی قورستر بێـت، بـەڵام هـەرگيز لـە بەديهێنەرەكـەی يـاخی نابێـت، بـەڵكو زۆر بەسـادەيی و ئاسـانی دەيپێچـێتەوە، هـەروەك چـۆن خـاوەن پـەرتوكێك پـەڕەكانی پەرتوكەكـە دەپێچـێتەوە. خـوای بـەتوانا و خـاوەن دەسەڵات لە ئايەتێكی تردا جەخت لەم ڕاستييە دەكاتەوە كە ئەم كارە بـۆ پـەروەردگار كـارێكی زۆر سـادە و ئاسـانە، وەك دەفـەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾الـروم/٢٧، واتــە: هــەر ئــەو زاتــە لــە ســەرەتاوە بەديهێنراوەكانی بەديهێناوە، پاشان (بەجۆرێكی تر دروسـتيان دەكاتـەوە) بێگومان ئەو كارە لە دروستكردنی سەرەتا لای ئاسانترە، نموونـەی بـەرز و وەسفی بڵند هەر شايستەی ئەو زاتەيە، لە ئاسمانەكان و زەويدا، بەڕاسـتی زاتێكی زۆر بەدەسەڵات و داناية.

دووەم: ئايەتەكـە گـەردوون بـە پـەڕەی ئاسـۆيی تـەخت دەچـوێنێت، دەگونجێت بەڕاستيش گەردوون تەخت بێت وەك دۆخێك لەنێوان گەردوونی داخراو و كراوەدا، ئەمەش كاتێك چڕيی گەردوون يەكسان دەبێت بـە چڕيی

مۆلەقە (زۆرێـك لـە زانایـانی گـەردوون ئـەم بۆچـوونە پەسـەند دەكـەن)... بەهۆی زۆر گەورەیی و فراوانی قەبارەی گەردوونـەوە (بـەگوێرەی ئێمـەوە) وەك ڕووتەختێك وەهایە (ئەگـەر لەڕاسـتیدا بـەوجۆرەش نـەبێت)، هـەروەك چـۆن لـە سـەرەتادا زەوی بـە ڕوویـەكی ئاسـۆیی تـەخت دادەنـرا لەلایـەن دانیشتوانەوە، تـاكو ئـەوە دۆزرایـەوە كـە زەوی گۆییـە. بۆیـە لێكچـواندنی زەوی بـە پـەڕەكانی تۆمارێـك نزیكـە لەواقیعـەوە بـەوەی ئێمـەی مـرۆڤ لـە هـەموو لایەكیـەوە گـەردوون بەڕوویـەكی تـەخت دەبیـنین، هـەتاكو وادێتـە بیرمـــان لەڕاســـتیدا گـــەردوون شـــێوەكەی تەختـــە (زۆر دەگونجێـــت بەوشێوەیەش بێت) لە شێوەی تەختیی پەڕەكانی پەرتوكێكدا .

سێیەم: ئایەتەكە بیری مرۆڤ بەرەو كشانی گەردوون پاشان هاتنەوەیەك و دارمـانی دەبـات. وێكچـواندنی پێچـانەوەی گـەردوون بـە پێچـانەوەی پـەڕەكانی پـەرتوكێك وێكچـواندنێكی ئێجگـار جـوان و بـەرزترە لـە هـەر وەسفێك كە بۆ ئەو حاڵەتە بكرێت. بەشێوەیەك تـەنها دەبێـت ئـەم وەسـفە لەلایـەن خوایـەكی كاربـەجێ و دانـاوە دەرچـووبێت كـە بەدیهێنـەری ئـەم گەردوونەیە.

دوای كشـان و فراوانبـوونی گـەردوون تـا ئـەم حاڵەتـەی ئێسـتای (یان ئـەوەی لـە داهـاتوودا پێیـدەگات) خـوای بەدیهێنـەری ئـەم گەردوونـە (بـە هـــەموو ئـــەوەی تێیدایـــە) دەیپێچـــێتەوە و دوای ئـــەو زۆر فراوانبـــوون و گەورەبوونە دەیگێڕێتەوە بۆ دۆخی سـەرەتای بـەدیهێنانی، بەتـەواوی وەك ئەوەی ئێستا فیلمێكی پێچـەوانە بـۆ كشـانی گـەردوون ببینیـت، دەبینیـت ئەســـتێرەكان لـــە لێكنزیكبوونەوەیـــەكی یەكبینـــەدان و گەلەســـتێرەكان دێنەوەیەك و قەبارەیان بچووك دەبێتەوە.

بەگشتی گەردوون دەیەوێت بەرەو باری سەرەتای بگەڕێتەوە. پاشان ئایەتەکە دڵنیایی ئەوە دەدات کە بەمشێوەیە گەردوون دەستیپێکرد و بەمشێوەیەش کۆتایی دێت بۆ ئەو وێنەیەی لە سەرەتاوە هەبووە.

﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَـٰعِلِينَ﴾.

ئەمە بڕیارێکی بەدیهێنەرە پێش دروستبوونی گەردوون، ڕۆژێك لە ڕۆژان گەردوون دەگێڕێتەوە بۆ شێوەی سەرەتای، بۆ خاڵێك کە چڕی و پلەی گەرمیەکی ناکۆتای هەیە یان بۆ شێوەیەکی تر کە تەنها لەزانستی خواییدا هەیە.

کرداری کشانی گەردوون و داڕمانی لەسەر خۆی، ئەو داڕمانە زۆر مەزنەی دەیگێڕێتەوە خاڵی سەرەتای بەدیهێنان، نزیکترین ڕاڤەیە زانست لەئێستادا دەتوانێت پێشکەشی بکات سەبارەت بە پێچانەوەی گەردوون یان پێچانەوەی ئاسمان وەك شێوەی سەرەتای بەدیهێنان.

لێرەدا چەند خاڵێك هەن پێویستە لەبەر چاو بگیرێن:

١. دەستەواژەی زانستی یان مرۆیی بۆ کرداری کشان و فراوانبوونی گەردوون کە داڕمانێکی زۆر گەورە بەدوایدا دێت، پێچەوانەکەرەوەی ئەو وێنانەن کە مرۆڤ دەیبینێت یان وێنای دەکات بۆ ئەم ڕووداوەی لە هێز و توندی و مەزنیدا لەسەرو وزە و توانایەوەیەتی، بەڵکو لەسەرو خەیاڵی مرۆڤیشەوەیە بۆ وەسفی کۆتایی گەردوون و ئەوەی تێیدایە (مرۆڤ وەك بەدیهێنراوێك لەسەر ئەم هەسارەیە، هەسارەی زەوی کە یەکێکە لە هەسارە پاشکۆکانی خۆر و خۆریش یەکێکە لەو چەندین بلیۆن ئەستێرەیەی گەلەستێرە پێکدێنن و بلیۆنەها گەلەستێرەش گەردوون پێکدێنن).

لەلایەکی دیکەوە لە دەستەواژە قورئانییەکەدا بۆ پێچانەوەی ئاسمان یـان گـەردوون هێمنیـەك دەبیـنین، ئەمـەش توانـا و دەسـەلأتی خـوای بەدیهێنـەری مـەزن دەنوێنێـت کـە ئـەم وتەیـەی فـەرمووە، کۆتاییهێنـان بەهەموو گـەردوون بـەلای بەدیهێننـەرەوە کـارێکی زۆر سانایە و ئاسـانترە لەوەی ئێمە هـەموو ڕۆژێـك ئـەنجامی دەدەیـن، ئـەویش پێچانەوەی چـەند پەڕەی پەرتوکێکە، واتە پێچانەوەی گەردوون هیچ قورسییەکی تێدا نییـە بۆ خوای بەدیهێنـەر، هـەروەك چۆن پێچانەوەی پـەڕەکانی پـەرتوکێك بـۆ ئێمەی مرۆڤ کارێکی گرا نییە.

٢. ئەگەر کۆتاییهـاتنی گـەردوون بـەپێی ڕاڤـە زانسـتییەکە بـە کشـان و پاشـان هاتنەوەیـەك و داڕمـانی، یارمـەتیمان بـدات لـە تێگەیشـتنی ئایەتـە پیرۆزەکـە و لەڕاڤـەی پێچـانەوەی ئاسمانـدا و گێڕانـەوەی گـەردوون بـۆ شـێوازی سـەرەتای بـەدیهێنان، ئـەوا زیـاد لـەوە وردەکـاری تـری تێـدا دەبینرێت، چونکە ئەمە تاکە ڕاڤە نابێت بۆ ئایەتەکە و پێچانەوەی خوایی بۆ گـەردوون دەگونجێـت بەشـێوەی کشـان و داڕمـان بێـت و دەشـگونجێت بەهەر شێوەیەکی تر بێت کە لە داهاتوودا بیزانین یاخود هەر نەیزانین.

بەهەمان شێوە ئەو کاتەی کرداری پێچانەوەکە دەیخایەنێت هەمان ئـەو کاتە بێت کە کرداری کشان و داڕمانەکە خایاندوویـەتی و هـەمان ئـەو کاتـە بێـت کـە کـرداری فراوانبـوون و کشـان خایاندوویـەتی، واتـە دەورووبـەری (١٥ملیـۆن سـاڵ)، دەگونجێـت لـەو کاتـەش زیـاتر یـان کـورتتر یـاخود لـە چاوتروکاندنێکدا ڕوو‌بدات.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ﴾

الزمر/٦٨، واتە: (ڕۆژێك دێت ئیتر بڕیاری خوایی دەبێت ئەنجام بدرێت، بەکۆتاییهێنان بە ژیانی دونیا و بەرپاکردنی ڕۆژی قیامەت) ئیتر فوو دەکرێت بە (صور)دا و هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەویدا مابێت دەستبەجێ دەمرێت، مەگەر کەسێك خوا ویستی نەبێت، لەوەودوا فوویەکی تری پێدا دەکرێتەوە (هەر هەموو خەڵکی) هەستاونەتە سەرپێ و چاو دەگێڕن (بە سەرسامییەوە) تەماشای یەکتر و دەورووبەر دەکەن.

بۆیە گەردوون (دەکرێت ناوبنرێت بۆشایی و کات) دوو بەدیهێنراون لە بەدیهێنراوەکانی خوا و هیچیان سەرپێچی ناکەن لە بەجێهێنانی مەراسیمی گوێڕایەڵی و وەلائی تەواو بۆ بەدیهێنەرەکەیان، ئەو خوایەی ئاسمانەکانی بەدیهێناوە و بەتوانایە لە گێڕانەوەی بەدیهێنانەکەیان یان بەدیهێنانی نموونەی ئەوانە بەهەمان شێواز یان شێوازێکی جیاواز، لەهەمانکاتدا یان لەهەر کاتێکی تردا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴾يس/٨١، واتە: ئایا ئەو کەسەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە ناتوانێت دووبارە دروستیان بکاتەوە؟! بەڵێ (زۆرچاك) دەتوانێت و ئەو لە دروستکردن و داهێناندا زۆر بەتوانا و زانایە.

# هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر

# پێشبینی دەکرێت (١١) بن نەك (٩)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذۡ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ﴾یوسف/٤، واتە: کاتێك یوسف بە باوکی وت: باوکی بەڕێزم! من لە خەومدا یازدە هەسارە و خۆر و مانگم بینی کڕنوشیان بۆ دەبردم.

تائێستا زانایان نۆ هەسارە لە هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆریان دۆزیوەتەوە (ئەگەرچی ڕا وەهاش هەیە کە هەشتن) ، پێدەچێت لە داهاتووشدا دوو (یان سێ) هەسارەی تر، وەك سەلماندنی خەوەکەی یوسف، بدۆزنەوە.

لە ڕۆژانی دابەزینی قورئاندا پێنج هەسارە ناسرابوون. دوای داهێنانی بنکەکانی تێڕوانینی گەردوونی ژمارەی هەسارەکان گەیشتنە نۆ هەسارە. هاوسەنگی گەردوونی لە کەماڵدایە، هەربۆیە بەر لە دۆزینەوەیان پێشبینی هەبوونی هەریەکە لە هەسارەکانی نیبتۆن و بلۆتۆ کرابوون، واتە لە ڕێگای ئەژمارکردنە گەردوونییەکانەوە سەرەتا دۆزرانەوە و لە پاشانیش بەهۆی تێڕوانینەوە، بینران و ئاشکراکران.

شـایانی ئاماژەپێدانـە ئـەژمارکردنی کۆمپیوتـەری گـەردوونزانی نوێـوە بـوونی هەسـارەیەکی لـە دوای پلۆتـۆوە دۆزیوەتـەوە کـە تـا هەنووکـە نـەبینراوە، ئـەو هەسـارەیە نـاونراوە (بروسـوبینا) و دەوروبـەری (١٠ملیـار کیلۆمەتر) لەخۆرەوە دوورە.

هەروەها زانایان پێشبینی بوونی هەسارەیەکی تریشیان لەنێوان خـۆر و عـەتاردا کـردووە و ناویاننـاوە (فولکـانو) کـە ئـەویش تائێسـتا نـەبینراوە. ئەگـەر بـوونی ئـەم دوو هەسـارەیەش بەتـەواوی سـەلمێنرا، ئـەوا ژمـارەی هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر دەبێتە (١١) نەك (٩).

# خۆرو مانگ بە حسابی ورد دروستکراون

خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ﴾الـرحمن/٥، واتـە: خـــۆر و مانگیشــــی بــــە حســــابێکی ورد دروســــتکردوون و داینــــاون لەخولگەکانیاندا و لە سوڕانەوەدان.

ئەم ئایەتە ئاماژە بە ساڵی خۆری و سـاڵی مـانگی نـادات، وەك هەنـدێك کەس گومان دەبەن، بەڵکو ئیعجازێکی گەورە ڕاڤە دەکات کە زانستی نـویێ ئاشکرایکرد، ئەویش ئەوەیە خۆر و مـانگ لـەڕووەکانی گـەرمی و قـەبارە و دوورییەوە سیستمێکی ورد و حساب بۆکراویان هەیە.

گـەر خـۆر کـەمێك گـەورەتر بێـت یـان نزیکتربـووەوە لـە زەوی ئـەوا گڕدەگرین. خۆئەگەر کەمێك بچـوکبووەوە یـاخود لـە زەوی دوورکەوتـەوە، ئەوکاتە دەیبەستین. بەهەمان شێوە مانگیش گەر کەمێك گـەورەتربوو یـان نزیکبـووەوە، بـەهۆی هەڵکشـانی دەریـاوە نقـومی ئـاو دەبـین، خۆئەگـەر کەمێك بچوك بێتەوە یاخود لە زەوی دوورتر بکەوێتەوە، دەریاکان نامێنن.

# حەوت ئاسمانی چین چین

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝١ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ۝٢ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ ۖ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ۝٣ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ﴾ الملك/١-٤.

ئێمە لێرەدا لەسەر ئەو بەشەی ئایەتەکە دەوەستین کە دەفـەرموێت: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا﴾ واتە: ئەو زاتـە ئاسمانـەکانی بەحـەوت چـین دروستکردووە.

زانایانی گەردوون دەڵێن: چینی یەکەم چینی هەوای ژێرەوەیە کـە مـرۆڤ و زیندەوەرانی تێدا دەژی، لـە باڵنـدە و ئـاژەڵان و درەخـت و ڕووەکـەکان. ئەم چینەش دیسانەوە لە چەند چینێکی تر پێکهاتووە، لـە دۆخێکـەوە بـۆ دۆخێکـی تـر و لـە جێگایەکـەوە بـۆ جێگایـەکی تـر دەگۆڕێـت، لـە دۆخـی گەرمییەوە بۆ دۆخی سارد و بۆ دۆخی هەورەکان، بۆ حاڵەتی باران، زریان، ئەو پەستان بەرزیی و نزمییانەی کەش کە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر دەگوێزرێنـــەوە و هـــەر ئـــەو گواســـتنەوەیەش بنـــەمای پێشـــبینییەکانی ئاووهەوایە.

چینی دووەم چینی گەردە گازییە کبریتییەکانە، ئەم گەردانە کرداری دابارینی باران ئاسان دەکەن، گەر ئەم چینە نەبوایە باران نەدەباری و ژیانیش لەسەر ڕووی زەوی نەدەبوو.

لەم چینەی دووەمدا چینی ئۆزۆن هەیە کە بریتییە لە بەرگێك و لە ئۆکسجینی سیانی پێکدێت و تیشکی سەروونەوشەیی کوشندە دەمژێت. لە تیشکی هاتوو لە خۆرەوە تیشکی سەرووەنەوشەیی هەیە چینی ئۆزۆن دەیمژێت و ڕێی پێنادات تێپەڕبێت تەنها بەبڕێکی زۆرکەم نەبێت. جێی باسە ئەو بڕە کەمەی تیشکی سەرووەنەوشەیی کە چینی ئۆزۆن ڕێ بەتێپەڕبوونی دەدات هەندێك لە میکرۆبی زیانبەخشی زیندەوەران دەکوژێت، بۆیە بەرکەوتن بە تیشکی خۆر بەسوودە و پاکژکەرەوەیە.

چینی سێیەم وێکچوی کورەیەکی ئەتۆمی کڵپەسەندووە. گەر ئەم چینەش نەبێت بەردە گەردوونییەکان و هەسارۆکە بەربووەوەکان هەموو شتێکی سەرزەوی خاپور و وێران دەکەن، بەڵام ئەم چینە هەموو شتێك دەتوێنێتەوە لە نەیزەك و کانزا و هەسارۆکە و بەردەکان. دواجار بەهۆی هێزی کێشکردنی زەوییەوە دەگەنە زەوی (دوای سوتانیان لەو چینەدا)، بەڵام دوای ئەوەی بوونەتە وردە تەپوتۆزی ئەوتۆ تەنها بە وردبین دەبینرێن.

چینی چوارەمی چینەکانی بەرگەهەوا چینی (ئایۆنۆسفێر)ە واتە چینی ئایۆنکار. ئەم چینە ئایۆنکارە بەرکەوتەی تیشکی خۆر دەبێت بە تیشکی سەرووەنەوشەیشەوە کە کاردەکاتە سەر تێکشکاندنی گەردیلەکانی گازی ئۆکسجین و نایترۆجین، بەوەش یەکێك لە ئەلیکترۆنەکان وندەکات و دەبێتە ئایۆن، واتە بارگاوی دەبێت. ئەو گەردیلانە پێیاندەوترێت ئایۆنی بارگاوی.

ئـەم ئایۆنانـە کـاری ملیۆنـان ئاوێنـەی کـەش دەکـەن، هەڵدەسـتن بـە پێچەوانەکردنەوە (دانەوە)ی شەپۆلە بێتەلـەکان لـە زەوییـەوە و بـەدەوری زەویدا پـەخشی دەکەن. هەر ئـەم ڕێگەیـەش بـەکاردێت بـۆ نـاردنی پەیامـە بێتەلەکان لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر، هەروەها بە هەموو جیهـان و بە هەموو ئاڕاستەکاندا.

چینی پێنجەم لە هەزار کیلۆمەترەوە درێژدەبێتەوە تاکو شەست و پێنج هەزار کیلۆمەتر. لەم چینەدا بەپلەبەندی هەوای تێدا کـەم دەبێتـەوە، تـاکو ئیتر نامێنێت. ئەستوری چـینی هـەوای دەوری زەوی زیـاترە لـە (٦٥هــەزار کیلۆمەتر) و زیاتر.

بەرگەهـەوا بەربەسـتێکی ڕاسـتەقینەیە، لـە ڕاسـتیدا چڕییەکەی کەمـە، بەڵام زۆر ئەستورە، تیشك ڕادەگرێت و شوهبەکان دەسوتێنێت. ژیانمان لە مەترسی دەپارێزێت، چونکە جگە لـە سوودبەخشـەکان ڕێ بـە تێپـەڕبوونی هیچ شتێکی زیانبەخش بەنێویدا نادات.

ئەمەی باسکرا یەکێکە لە لێکدانەوەکانی حەوت چینەکەی ئاسمان...

# ڕێنمویی بەهۆی ئەستێرەکانەوەیە نەك هەسارەکان

لەوکاتـەدا کـە زانسـتی ئـەزمونکاری جیـایی ناکـات لـەنێوان ڕوونـاکی و نـووردا، قورئـانی پـیرۆز وەسـفی خـۆر دەکـات بـەوەی ڕووناکیبەخشـە و مـانگیش نووربەخشـە. پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا﴾یونس/٥.

ڕووناکی (ضوء) ڕاستەوخۆ لەو تەنەوە دەردەچێت کە خـۆی ڕوونـاکیی دروسـتدەکات، کاتێـك ئـەو ڕووناکییـەش دەکەوێتـە سـەر تـەنێکی تاریـك نوورەکەی دەداتەوە.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَعَلَٰمَٰتٍ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾النحـل/١٦، واتــە: و نیشــانەی زۆر و زەبەنــدی لــە زەویــدا دابینکــردووە و بــەهۆی ئەستێرەکانەوە خەڵکی ڕێی خۆیان دەرببەن.

یــان دەفــەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾الانعام/٩٧، واتە: هەر ئەو زاتە، ئەستێرەی بۆ فەراهەم هێنـاون تـا ببێتـە هـۆی ڕێنمویتـان لـەناو تاریکییـەکانی سـەر ڕووکـاری وشـکانی و دەریاکاندا.

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەوە داوە کە ڕێنمویی لە تاریکییەکاندا بەهۆی ئەستێرەکانەوەیە نەك هەسارەکان، لەگەڵ ئەوەشدا هەسارەکانیش نوور و ڕۆشناییان وەك ئەستێرەکان دەگاتە زەوی.

زانستی نوێ سەلماندوویەتی ئەستێرەکان سەرچاوەی ڕووناکی بنەڕەتین لە ئاسماندا، چونکە ئەوانە تەنی ئاسمانی کڵپەسەندوون و پلەی گەرمییان دەگاتە ملیۆنان پلەی سەدی، لەبەرئەوە ڕووناکی لە خودی خۆیەوە بەرهەم دێنێت و بەرەو دەرەوە دەریدەکات و بەوەش گۆی زەوی ڕووناك دەکاتەوە.

بەڵام ڕۆشنایی (ڕووناکی) هەسارەکان بنەڕەتی نین، بەڵکو نوور و ڕۆشنایی لە ئەستێرەکانەوە وەردەگرن و بەرەو زەوی دەیدەنەوە، ئەوەش لەبەرئەوەی هەسارەکان تەنی ئاسمانی ساردن و ئاگریان لەنێودا نییە و ناتوانن لە خودی خۆیانەوە ڕووناکی پەخش بکەن.

لێرەدا تێبینی دەکرێت کە قورئانی پیرۆز هەسارەکانی ناونەبردووە بەوەی هۆکاری ڕێنمونی بن لە تاریکییەکاندا، بەڵکو تایبەتی کردووە تەنها بە ئەستێرەکانەوە، ئەوەش لای مرۆڤ بەر لە ١٤سەدە بەدڵنیاییەوە نەزانرابوو.

# کۆتایی مانگ لە ڕۆژی دواییدا

پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ۝٧ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ۝٨ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ﴾القيامـة/٧-٩، واتــە: کاتێـك دێـت، چـاو ئەبڵـەق دەبێـت، مـانگیش دەگیرێت و تاریك دەبێت، خۆر و مانگ کۆدەکرێنەوە.

لەبەرئەوەی خـۆر بـە بـەردەوامی بارسـتاییەکەی کەمـدەکات، هەربۆیـە دەبێت زەویش بەشێك لە بارستاییەکەی ون بکات لەپێناو مانەوەی دووریی نێوانیانـدا بـەجێگیری، لەبەرئـەوە زەویـش ملیۆنـان تـۆن لـە گـاز و تـۆز وندەکات.

بــەوەی زەوی بــە بــەردەوامی بارســتاییەکەی کــەم دەکــات بــۆ پارێزگاریکردن لە دووریی جێگیری لەگەڵ خۆردا، هەربۆیە دەبێت مـانگیش بۆ پاراستنی دووریی نێوان خۆی و زەوی بارستاییەکەی کـەم بکـات، بـەڵام ئەمە ڕوونادات، مانای ئەمەش وایە دووریـی نێـوان زەوی و مـانگ جێگیر و چەسـپاو نابێــت، بــە دروســتی هـــەر ئــەوەش ڕوودەدات. توێژینــەوە گەردوونییەکان سەلماندویانە مانگ بەردەاوم لە زەوی دووردەکەوێتەوە.

زانایان ڕاڤـەی هۆکارەکـانی ئـەم دیاردەیـەیان کـردووە بـەوەی خێرایـی سوڕانەوەی بەدەوری تەوەرەکەیدا بە پلەبەندی کەمـدەکات بـەهۆی (بـا) و کــرداری هەڵکشــان و داکشــان، ئــەوەش دەبێتــەهۆی زیـادبوونێکی زۆر

لـەخێرایی سـوڕانەوەی مـانگ بـەدەوری تەوەرەکەیـدا و ئـەو زیـادبوونی خێراییەش هۆکاری دوورکەوتنەوەیەتی لە زەوی.

زانایـانی فەلـەك دەڵـێن: مـانگ کـە دووریـی (٣٨٥هـەزار کیلۆمـەتر) لـە زەوییـەوە دوورە، هـەموو سـاڵێك (٣ سـانتیمەتر) بـە بـەردەوامی دوورتـر دەکەوێتەوە.

ئـەم دوورکەوتنـەوە بەردەوامـە لـە داهاتوویـەکی دووردا مـانگ دەخاتـە بواری کێشکردنی خۆرەوە، لە دواییشدا ئەوە دەبێتەهۆی تەقینەوەی مانگ لەسەر ڕووی خـۆر. ئـەم زانیارییـە زانسـتییە بەتـەواوی لەگـەڵ ئایەتەکـەدا دێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ﴾القیامة/٩.

لە ئایەتی ﴿وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ﴾یشدا، (خسف) بە مانـای ونبـوون دێـت، واتـە نەمانی ڕووناکی. تێبینی دەکەین ﴿وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ﴾ پێش ﴿وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ﴾ دێت لە ئایەتە پیرۆزەکەدا، واتە ونبوونی ڕۆشنایی مانگ پێش کۆبوونەوەی لەگەڵ خۆردا ڕوودەدات.

ئەمەش یەکێکی ترە لە ئیعجازە گەردوونییەکانی قورئانی پیرۆز. زانایان دەڵێن: لەکاتی دوورکەوتنەوەی لە زەوی، مانگ بە پلەبەندی ڕووناکیدانەوە لە ڕووەکەیەوە کەمدەکات تاکو بەتەواوی دیارنامێنێت و وندەبێت، ئەوەش مانای (خسوف القمر) دەگەیەنێت.

# مردنی ئەستێرە

زاراوەی ئەستێرە بە تەنێکی گەردوونی پرشنگداری گۆیی دەوترێت کە بەردەوام کارلێکی ناوکەیەکبوونی تێدا ڕوودەدات، ئەویش بە یەکگرتنی ئەتۆمە سوکەکانی گازی هایدرۆجین، کە ئەم گازە پێکهاتەی ئەستێرەکانە. لە ئەنجامی ئەم کارلێکەدا گەرمی و ڕووناکی و تیشکەکانی تر پەیدادەبن و هایدرۆجینیش بۆ هیلیۆم دەگۆڕێت.

بۆنموونە خۆر پلەی گەرمی چەقەکەی (١٥ملیۆن پلەی سەدی)یە. زانایان پێیان وایە خۆرەکەی خۆمان بڕێکی زۆر هایدرۆجینی هەیە. هەروەها خۆر لە هەر چرکەیەکدا (٦١٦ملیۆن تۆن) هایدرۆجین دەکات بە (٦١٢ملیۆن تۆن) هیلیۆم، بەمەش (٤ملیۆن تۆن) کەمدەکات کە دەبێتە وزە بەشێوەی گەرمی و ڕووناکی و تیشکەکانی تر.

بەم شێوەیە بڕی (٥٣,٢٢٢,٤٠٠,٠٠٠,٠٠٠ تۆن) هایدرۆجین سوتەمەنی ڕۆژێکی خۆرە، هەروەها لە هەر مەترێکی چوارگۆشەی خۆردا نزیکەی (٦٤ملیۆن وات) وزە دەنێرێتە دەرەوە. کەواتە خۆر بەردەوام لە کەمبووندایە و ڕۆژێك دێت دەکوژێتەوە و دەبێتە تەنێکی ئاسمانی وەك کونی ڕەش یان نیوترۆنە ئەستێرە، یان گرگنی سپی.

ئەستێرە بە قۆناغەکانی ژیانی خۆیدا تێپەڕدەبێت، لە سەرەتای دروستبوونیەوە لە تەمگەلەوە، پاشان لەوپەڕی گەنجیدا کە کارلێکەکانی

بەردەوامە و بڕێکی زۆر هایدروجینی هەیە و لە کۆتاییشدا پاش نەمانی هایدرۆجینەکەی و گۆڕانی بۆ تەنێکی ئاسمانی تر کە سیفەتی ئەستێرەی تێدا نییە. ئەستێرەکان لەم قۆناغەدا دەگۆڕێن بۆ زەبەلاحی سوور یان نیوترۆنە ئەستێرە یان گرگنی سپی یاخود کونی ڕەش... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝١ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ﴾التکـــــویر/١-٢، دیارە کوژانەوەی خۆر واتای نەمانی کارلێکی ناوکە یەکبوونەکانیەتی کە ئەوکاتە هیچ ڕووناکییەك نادات، هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ﴾النجم/١، واتە: سوێند بە ئەستێرە کاتێك دەمرێت.

# خۆر گەورەترە لە مانگ

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾الأنعـام/٧٥-٧٩، واتــە: بــەو شــێوەیەش دەســەڵاتی تۆکمەمان لـە ئاسمانـەکان و زەویـدا نیشانی ئیـبراهیم دەدەین بۆئـەوەی بەڵگە بەدەست بێت و لەڕیزی دڵنیاکاندا بێت، ئینجا کاتێك شەو باڵی کێشا بەسەر ئیبراهیمدا ئەستێرەیەکی (گەشی گەورەی) بینی، بۆیە وتی: ئاگادار بن وادابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، کاتێك ئەستێرەکەی لێ ئـاوابوو وتـی: من شتی لەبەرچاو ونبـووم خۆشـناوێت و نایپەرستم. ئینجـا کاتێـك مـانگی بینی هەڵهات، وتی: ئاگادار بن، وادابنـێین ئەمـەیان پەروەردگارمـە، کاتێـك ئەویش ئاوابوو وتی: سوێند بەخوا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتی نەدامایـە، ئەوە بێگومان لەڕیزی دەسـتەی گومڕاکانـدا دەبـووم. ئینجـا کاتێـك خـۆری بینی هەڵهات، وتی: ئاگـادار بـن، وادابنـێین ئەمـەیان پەروەردگارمـە، ئەمـە

گەورەتریشە کاتێك ئەویش ئاوابوو وتی : ئەی خەڵکینە، ئەی خزمینە، بەڕاستی من بەریم لەو شتانەی ئێوە کردوتانە بە هاوەڵ و هاوبەش بۆ (پەروەردگار). بەڕاستی من ڕووی خۆم و دڵم لە پەرستندا کردووەتە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەوی فەراهەمهێناوە، لەکاتێکدا ڕووم لە هیچ شتێکی تر ناکەم، بە دڵئارامی تەواویشەوە (دەڵێم کە): هەرگیز من لەڕیزی هاوەڵگێراندا نیم بۆ پەروەردگار.

ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لیبێت) چاو بەئاسماندا دەگێڕێت بەو نیازەی بەدیهێنەری بدۆزێتەوە کە گەورەترە لە هەموو شتێك. بۆیە لە




تێڕاماندا بە پلەبەندی لە بچوکەوە تا پایەبەرزەکان دەچێت، بە هەسارەی ڕۆشن دەستپێدەکات کە بەبچوکی دەیبینێت و پاشان ئاوڕ بۆ مانگی درەوشاوە دەداتەوە لە چواردە شەویدا کە ڕووناکییەکەی ئاسمانی پڕ کردبوو، بەڵام زۆری نەبرد ئەویش ونبوو، لەدواییدا دیدو هزری بەرەو خۆر

ئاراستە دەکات، بە گەورەتر لە هەسارە و مانگیش دەیبینێت... ئەمە سەبارەت بە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) و پلەبەندی بیرکردنەوەی مرۆییانە، بەڵام ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژە بە خۆر دەدات بە دەستەواژەی (أكبر) و ئەو دەربڕینەی بۆ مانگ بەکارنەهێناوە گەرچی پەپکە دیارەکەشی کەمێك گەورەترە لە پەپکەی خۆر، زۆریش لە هەسارەکان گەورەتر دەردەکەوێت. خوای زانا و دانا و دابەزێنەری قورئان فێرمان دەکات خۆر لە مانگ و هەموو هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر گەورەترە.

زانستی نوێ سەلماندویەتی مانگ زۆر لە خۆر بچوکترە، تیرەکەی (٤٣٦ جار) لە تیرەی خۆر بچوکترە و (٣٣٣هەزار جار) لە هەسارەی زەوی بچوکترە.

# خۆر دەجوڵێت و مەلە دەکات

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ﴾الرعـد/٢، واتـە: خـوا ئـەو زاتەیـە کـە بەچـاوی خۆتـان دەیبیـنن چـۆن ئاسمانـەکانی بـەبێ کۆڵەکـە و سـتوون بەرزکردووەتەوە و ڕایگرتووە، لەوەودوا چووە سـەر تـەختی فـەرمانڕەوایی بـەو شـێوەیەی کـە لایـەق بەخۆیـەتی، خـۆر و مانگیشـی ڕامهێنـاوە، هەریەکەیان لـە چـەرخ و خـولی خۆیاندا بێوچـان تـا ماوەیـەکی دیاریکراو دەسوڕێنەوە، هەر ئەو زاتـە کاروبـاری جیهـان هـەر هـەمووی بەڕێدەکات و ڕێکدەخات، هەروەها ئایەتـەکانی قورئـان بـەوردی و دووروودرێـژی دەخاتـە بەرچاو بۆئـەوەی دڵنیـابن لـە بەخزمـەت گەیشـتن و ئامـادەبوونی بـەردەم دادگای پەروەردگارتان (بۆ لێپرسینەوە).

یـــان دەفـــەرموێت: ﴿وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾یس/٣٨، واتە: خۆریش لە گەردش و سوڕانەوەی خۆیدا بەردەوامە و بەرەو سرەوت دەچێت، یـاخود بـەدەوری چـەقی خۆیـدا دەسـوڕێتەوە، بێگومان ئەوە توانای زاتێکی باڵادەست و زانا دەردەخات.

ڕاڤـەکارانی قورئـــان (وەك ڕازی و طـبري و قـرطبي) لـە ئایەتـەکانی قورئانـــەوە ئـــەو ڕاســـتییەیان هـــەڵهێنجاوە کـــە خـــۆریش وەك زەوی و

هەسارەکانی تر لە باری جوڵە و مەلەی بەردەوامدایە، لە خولگـەی تایبـەت بەخۆیدا.

چینی و یابانییەکان توانییان پێشبینی خۆرگیران و مـانگگیران بکـەن و لەپاشان گرنگیدان بـە زانسـتی گەردووننـاسـی لـە سـەردەمی یۆنانـدا زیـاتر بوو... تالیس و بەتلیمۆس و ئەرستۆ وتیان زەوی جـێگیر و چەسـپاو و بـێ جوڵەیە، زەوی چەقی گەردوونە و خۆر و هەموو هەسارەکان لە خولگەیەکی گۆیی داخـراودا بەدەوریـدا دەسـورێنەوە. لـە سـەرەتای سـەدەی سـێیەمی پێش زایندا "ئەریستادکوس" تیـۆریکی تـری هێنـا و وتـی زەوی بـەدەوری خۆردا دەسورێتەوە، بەڵام وایدانا خۆر جێگیر و بێ جوڵەیە.

خـەڵکی ئـەم تیۆرەیـان ڕەتکـردەوە و بانگەشـەکارانی تیۆرەکـەیان بـە گومڕا و سەرلێشێواو دانا و توندترین سزایان دەدان... مەسـەلەکە هـەروەك خۆی مایەوە تا کۆتایی چاخی ناوەڕاسـت (لەسـاڵی ١٥٤٣ز)، کاتێـك زانـای پۆڵەنــدی "کۆپـــەرنیکۆس" کتێبەکـــەی خـــۆیی لـــەبارەی گـــەردوون و هەسارەکانەوە بلاوکردەوە، لە کتێبەکەیدا بـیردۆزی سـوڕانەوەی زەوی بـە دەوری خۆردا جێگیرکرد، بەڵام دیسانەوە ئەمیش خۆری بە وەستاو دانا.

لەپاشان و لەدوای داهێنانی تەلەسکۆب ئەم تیۆرەیـە بـووە ڕاسـتییەکی زانستی و وردەوردە زانایان مەیلیان بەرەو ئـەو هـزرە ڕۆیشـت تـاکو زانـای گەردووننـاسی ئیتاڵی "گالیلۆ" توانی بگاتە ئەم ڕاستییە، بەهۆی چاودێری و تەماشـاکردنی بـەردەوامی جوڵـەی ئەسـتێرە وهەسـارەکان (لـە سـەدەی حەڤدەدا).

لە هەمان سەدەدا زانای گەردووننـاسی ئەڵمانی "کیپلـەر" گەیشـتە ئـەو ڕاسـتییەی هەسـارەکان تـەنها بـەدەوری زەویـدا ناسـوڕێنەوە، بـەڵکو لـە خولگـەی تایبـەتی هێلکـەیی (أهليليجـی)دا بـەدەوری خـۆردا (سـەنتەر) دەسوڕێنەوە.

زانای ئینگلیزی "ڕیچارد کارینگتۆن" لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا ئاشکرایکرد خۆر بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە بە ماوەی (٢٨ ڕۆژ و ٦ کاتژمێر و ٤٣ خولەك)، ئەوەش لەڕێی شوێنکەوتنی خۆرەپەڵە (البقع الشمسية) کە لە خۆردا دۆزرایەوە.

"کیپلەر" ئاشکرایکرد خۆر و هەسارەکانی لە خولگەی تایبەتیاندا مەلەدەکەن بەپێی ڕژێمێکی زۆر ورد و نایاب کە "ڕیچارد کارینگتۆن" دۆزییەوە (خۆر بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە).

لە ئینسایکلۆپیدیای ئەمریکیدا هاتووە: خۆر بەخێرایی (٢٢٠ ملیۆن کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا) بەدەوری چەقی گەلەستێرەی ڕێی کاکێشاندا دەسوڕێتەوە، هەروەها هەسارە گەڕۆکەکانیش لەگەڵیدا مەلەدەکەن کە هەر سوڕێکی تەواو بەدەوری گەلەستێرەکەیدا بە ماوەی (٢٥٠ ملیۆن ساڵ) تەواو دەکات.

هەر لەکاتی لەدایکبوونیەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ (٤,٦ ملیار ساڵ) خۆر و پاشکۆکانی هەژدە خولیان بەدەوری گەلەستێرەی ڕێی کاکێشاندا تەواوکردووە.

هەر لەهەمان ئینسایکلۆپیدیادا هاتووە کە گەلەستێرەی ڕێی کاکێشان (١٠٠ بلیۆن) ئەستێرە لەخۆدەگرێت (ئێستا هەندێك لە زانایان بە ٢٠٠بلیۆن ئەستێرە لەقەڵەمی دەدەن) هەریەك لەو ئەستێرانە لەگەڵ گاز و تۆزی گەردوونیدا کە لەنێوانیاندایە بەدەوری چەقی گەلەستێرەدا دەسوڕێنەوە.

خۆر ملیاران کیلۆمەتر (٢,٧ × $10^{17}$ کیلۆمەتر) لە چەقی گەلەستێرەکەوە دوورە و بەخێرایی (٢٢٠ کیلۆمەتر/چرکە) دەجولێت... هەر خولێکی تەواوی سوڕانەوەی خۆر بەدەوری چەقی گەلەستێرەی ڕێی کاکێشاندا نزیکەی (٢٥٠ ملیۆن ساڵ) دەخایەنێت.

# مانگیش لە جوڵەی بەردەوامدایە

زانستی نوێ سەلماندویەتی خۆر و مانگیش دەجولێن، لـە ئایـەتی (٢)ی سورەتی (الرعـد)دا پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾... کەواتە هەریەکە لە خۆر و مانگیش لەجوڵەدان.

پـەروەردگار دەفـەرموێتت: ﴿لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾یس/ ٤٠، واتـە نـە خـۆر بـۆی هەیە بە مـانگ بگـات، نـە شـەویش پـێش ڕۆژ دەکـەوێت، بـەڵکو هەریەکـەیان لـە خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلەدەکەن و بەئاسانی دەسوڕێنەوە.

هەریەکە لە خۆر و مانگ بەخێرایی تایبەت بەخۆیان دەسوڕێنەوە:

١. خێرایی جوڵەی خۆر ١٢ کیلۆمەترە لە هەر چرکەیەکدا.

٢. خێرایی جوڵەی مانگ ١٨ کیلۆمەترە لە هەر چرکەیەکدا.

٣. خێرایی جوڵەی زەوی ١٥ کیلۆمەترە لە هەر چرکەیەکدا.

ئێستا بڕوانە... بەدڵنیاییەوە هەستی پێدەکەیت کـە هـۆی ئـەوە چییە هەرگیز خۆر بە مانگ ناگات.

گەر سەرنجی خێرایـی هەریەکـەیانمان دا بەتـەواوی لـە ئیعجـازی وتـەی خوایی: ﴿لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ﴾ تێدەگەین.

# شەفەقی جەمسەری

خوای پەروەردگار دەفەرمویت:﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ﴾الإنشقاق/١٦، واتە: سوێند بە شەفەق (ئەو ڕەنگە سوورەی کە لەکاتی خۆرئاوابووندا پەیدا دەبێت).

کاتێك تیشکی خۆر دەکەوێتە سەر بەرگەهەوای دەوری زەوی و بەو کریستاڵە بەفرییە بچوکانەدا تێپەڕدەبێت کە لەشێوەی وردە شوشەدان و بەنێو بەرگەهەوادا بڵاودەبنەوە، ئەودەمە تیشکی خۆر بۆ حەوت ڕەنگەکەی شەبەنگەبەڕۆژ شیدەکەنەوە و پەلکەزێڕینە دروستدەکەن.

بەڵام دیاردەی شەفەقی جەمسەری کە لەجەمسەرەکانی زەویدا ڕوودەدات، لە ئاکامی چەند کردارێکی ئاڵۆزدا دەبێت. خۆر ملیۆنان تەن لە بەرهەمی تەقینەوەکانی خۆی فرێدەدات و لە ئاکامی ئەو تەقینەوانەشەوە پشتێنەیەکی زۆر بەهێز بۆ خۆر دروستدەبێت. هەرکات ئەو پشتێنە موگناتیسییەی خۆر لەگەڵ پشتێنە موگناتیسییەکەی زەویدا پێکدەگەن، کارلێك دەکەن و لە ناوچەی جەمسەرەکاندا دەڕەوێتەوە، لە ئەنجامی ئەوەشدا دیاردەی شەفەقی جەمسەری زەوی ڕوودەدات کە بەڕاستی دیاردەکە دیاردەیەکی سەرنجڕاکێش و ئایەتێکی زۆر نایابی خوای مەزنە.

زانایان ئەو ڕاستییە زانستییەیان دۆزییەوە کە زەوی لە هەموو لایەکانیەوە بە پشتێنەیەکی موگناتیسی دەورەدراوە، خۆریش گەردەلول و

بایەکی زۆر بەهێز دەردەکات و ئـەو بـا توندەش ڕووەو زەوی دێن و لێـی نزیك دەبنەوە ، بەڵام ئەو پشتێنە موگناتیسییە ڕێ بە نزیکبوونـەوەی ئـەو گەردەلولە بەهێزانە لەزەوی نادات.

کـاری پشـتێنەی موگناتیسـی زەوی نەهێشـتنی کاریگـەری گـەردەلولی خـۆرە، کـارلێکی لەگـەڵ دەکـات و دەیڕەوێنێتـەوە، ئـەم کـردارەش دەبێتەهۆی ئەوەی بەشـی دەرەوەی بەرگەهـەوای زەوی کڵپەیـەك بکـات و ئەو دیمەنە نایابانە دروست بکات.



# لەتبوونی مانگ

یەکێك لە نایابترین موعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) موعجیزەی لـەتکردنی مانگـە، بێبـاوەڕان هەوڵیانـدا بـەدرۆی بخەنـەوە، بـەڵام بـەهۆی گـەورەیی ڕووداوەکەوە بوێریی ڕەتکردنەوەی یەکجارەکی ئەو موعجیزەیـەیان نـەبوو، وتیان سەرەتا با چاوەڕوانی کاروانییەکان بکەین، محمد سیحری لەچـاومان کردووە، بەڵام هەواڵەکانی ئـەوان ڕاستییەکە دەردەخـات، دواجـار هـەواڵی کاروانچیان ڕاستێتی موعجیزەکەی سەلماند.

بەپێی ڕای زانایانی جوگرافیا، باشترین ناوچە بۆ بینینی لەتبوونی مانگ (بە دانانی ئەوە کە ڕوویداوە ! !) لەدوای نیوەدورگـەی عـەرەبی هیندسـتان بووە، جێی سەرسامی زانایانی مێژوویی ڕۆژئـاوایی بـوو کاتێـك لـە تۆمـاری ئەو ماوەیەدا بینیان باس لەوە کراوە کە:

أ- لەشــاری دهــار (Dhar)ی هینــددا پادشــاکەی (Bjoh Raj) و گەلەکەی (بە سەرجەم چین و توێژەکانەوە)، موعجیزەی لەتبوونی مانگیان بینیوە.

ب- لە کەنار چامال (Chamal) پادشای ناوچـەکە لـە کۆشـکەکەیەوە لەتبوونی مانگی بینی، توشی ترس و فۆبیایەکی گەورە بوو چونکە گومانی دەبـرد ئـەوە کۆتـایی دونیایـە، بـەڵام لـەپاش ماوەیـەك بیسـتی کـە ئـەوە موعجیزەی پێغەمبەرێکە لە نیوەدورگەی عەرەبی دەرکـەوتووە. وەزیرێکـی

خۆی بۆ چاوپێکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) نارد و وەزیرەکە دڵنیابوو لە باسەکە و لەسەر دەستی پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمان بوو... لە ئەمڕۆدا لایەنگران و شوێنکەوتوانی ئەو پادشایە لە هەندێك ناوچەی شاری دهار (Dhar)ی هیندستان دەژین.

ج- تەنها دەسەڵاتداران نەبوون، بەڵکو زۆرینەی دانیشتوانی هیندستان ڕووداوەکەیان بینیوە، هەندێکیان ئەو ساڵەیان وەك ساڵێکی جیاکەرەوەی مێژوویی بەکارهێناوە، لە هەندێك کتێبیشدا ئاماژەیان پێکردووە. بۆنموونە یەکێك لە پەیکەرە (شوێنەوارییەکان)ی ئەو ماوە زەمەنیە لەسەری نووسراوە (لەو ساڵەدا دروستکراوە کە تێیدا مانگ بوو بە دوو لەتەوە).

د- لەدوای چواردە سەدە تێپەڕبوون بەسەرموعجیزەکەدا و لە (٤ی مایسی ساڵی ١٩٦٧ن) دا و لە بنکەی گەردوونی کوپە کەنەدی (Cope Kennedy) یەکێك لە کەشتییە فەزاییەکان وێنەی ڕووی تاریکی



مانگی گرت (کە لەلای ئێمەوە نابینرێت) لە دووری (٣٠٠٠ کیلۆمەتر)، لەبەرئەوەی لە دوورییەکی کەمەوە وێنەکان گیران، ئەو وێنانە زۆر بەڕوونی ڕووی مانگیان پێشاندا (بە وردیی ٩٥٪ و وێنەکان لە ئەرشیفدا بە ژمارەی (١٨٠٥-٦٧) دانران... ئەو تایبەتمەندیەی ئەم وێنانە لە وێنەکانی تر

جیادەکاتەوە ئەوەیە کە وردەکاری زۆری لەخۆگرتبوو. زانایان بینیان درز یان قلّیشانێك لەسەر ڕووی مانگ هەیە وەك پشتێنەیەك بەدرێژیی (٢٤٠ کیلۆمەتر) و فراوانی (٨ کیلۆمەتر) و چەقی ئەم لەتبوونەش دەکەوێتە سەر (٦٥ پلە) باشور و (١٠٥ پلە) خۆرهەڵات.

ئەو لەتبوونانەی لە هۆکارە سروشتییەکانەوە دروستدەبن شێوەی شەپۆلیان هەیە و لە ئاڕاستە و درێژیدا ڕێکوپێك نین، بەڵام ئەوەی زانایانی سەرسام کردووە تەنها لەتبوونەکە نییە (گەرچی تەنها لەتبوونەکەش بەسە بۆ وروژانی هەزاران پرسیار)، بەڵکو ئەو لەتبوونەیە (درزەیە) کە بەنزیکەیی هێڵێکی ڕاستی ڕێك پێکدێنێت.

هەر هەمان ئەو دیاردەیە بیری (نیل ئارمسترۆنگ)ی سەرسام کرد کە یەکەمین کەسە پێیەکانی خستە سەر خاکی مانگ، تا ئەودەمەی زانایانی میسر موعجیزەی لەتبوونی مانگیان تێگەیاند.

لەو وێنانەی مانگ کە کەشتییەوانە فەزاییی یان مانگە دەستکردەکان گرتونیان بەڕوونی ئەو درز و کەلێنە دەبینرێت کە وەك پشتێنێك دەوری مانگی داوە. یەکێك لەو نەخشانە نەخشەیەکی زانای ئیتاڵی کاسینی (Cassini)ـە کە مێژووەکەی بۆ زیاتر لە (٣٠٠ ساڵ) پێش ئێستا دەگەڕێتەوە.

هەروەها هێڵێکی ڕاستی هاوشێوە لەسەر ڕووی مانگ دەبینرێت و بەپێی ڕای زانایانی گەردووونناس ئەو هێڵە دەبێت پڕبێت لە (magma)، کاتێك ڕووناکی خۆری دەکەوێتە سەر بریقەدار دەبێت.

نەخشەکەی (کاسینی) لای زانایانی ئەم چەرخەش بە یەکێك لە بەڵگەنامە باوەڕپێکراوە گرنگەکان دادەنرێت کە هیچ گومان لەسەر ڕاستو دروستییەکەی نییە، چونکە بە بەراوردکردنی بە وێنە و نەخشەکانی

ئەمرۆمان، هاوتاییەکی نایاب لەنێوانیاندا دەبینرێت، بەلاّم زانایانی ئەم سەردەمە بێدەنگن لە باسکردنی ئەم ڕاستییە بینراوە.

لەڕاستیدا دەستێکی شاراوە هەیە هەڵدەستێت بە دانانی تیۆرگەلێك بۆ شاردنەوەی کۆمەڵێ ڕاستی زانستی کە ئاینی ڕاستەقینە (ئیسلام) پاڵپشتی دەکات. یەکێك لەوانە دیاردەی لەتبوونی مانگە کە زۆرکەم نەبێت باسی لێوە نەکراوە، وێڕای ئەوەش کە لە دیارترین و سەرنجڕاکێشترین دیاردەکانی مانگە.

دیارە ئەم هێڵی کەرتبوونە لە سەردەمە نزیکەکان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) زۆرتر ڕوون و ئاشکرا بووە، چەند لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دوورتر بکەوینەوە بەرەو سەردەمی ئێستامان، دەبینین هێڵەکە بە پلەبەندی کاڵ دەبێتەوە و دیارنامێنێت، چونکە ڕووی مانگ کاریگەر دەبێت بە:

١. لێشاوی ئەو نەیزەکانەی دەکەونە سەر ڕووەکەی.

٢. ئەو گۆڕانە زۆر گەورەیەی پلەی گەرمی کە ڕۆژانە لەسەر ڕووەکەی ڕوودەدات.

٣. ئەو شلە گەرمیانەی کە هەندێجار لێرە و لەوێ دەتەقن.

جگە لەوانەش هۆکارگەلێك هەن وادەکەن ئەو هێڵەی لەسەردەمی (کاسینی)دا ئەو ڕوونییەی هەبوو، ئێستا زۆر لەو ڕوون و ئاشکراییەی نەمابێت. لە بەرامبەر ئەوەدا هۆکارە تەکنەلۆژیاکانی ئێستا دەتوانن تەنانەت پێکهاتەی ناوەکی مانگیش (بۆ قووڵی دەیان مەتر) ئاشکرا بکەن، بۆیە سەردەمی ئێستا باش و باشترە بۆ زانین و ئاشکراکردنی ئەو درز و کەلێنە گەورەیە، بەلاّم!!!

# مادده و دژە مادده

خوای گەورە مرۆڤی بە نێر و مێ بەدیهێناوە، وەك دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ﴾الحجـــرات/١٣، واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە و کردومانن بە گەلان و تیرە و هۆزانی جۆربەجۆر تا یەکتر بناسن.

پەروەردگار مرۆڤی بە نێر و مێ دروستکردووە هەتاکو هاوەڵێکی هەبێت، هەتاکو یەکتر بناسن و خۆشەویستی لەنێو بەدیهێنراوەکانیدا هەبێت. ئەم سیستمە تەنها لای مرۆڤ نییە، بەڵکو شانشینی ئاژەڵانیشی گرتووەتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ﴾النجم/٤٥-٤٦، واتە: هەر ئەو زاتەیە کە جووت و دوانە، نێر و مێی بەدیهێناوە، لە نوتفەیەك و گەشە بکات.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ﴾هود/٤٠، واتە: وتمان-ئەی نوح- لە هەموو نێر و مێیەك دوان هەڵبگرە.

مرۆڤ و بەشە جیاوازەکانی ئاژەڵان و ڕووەك و سەرجەمیان لە شێوەی نێر و مێ بەدیهێنراون، ئەمە ئەو زانیارییەیە کە قورئـان هەواڵ دەدات و زانستی زیندەوەرزانی جەختی لەسەر دەکاتەوە.

سەرەڕای ئەوانە، لەم ئایەتەدا ئاماژەیەکی گشتگیرتر دەبینین کاتێك خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ

نَذَكَّرُونَ﴾الذاريات/٤٩، واتە: لە هەموو شتێك ئێمە جووتمان دروستكردووە، بەڵكو بیربكەنەوە و یاداوەری وەربگرن.

دەربـارەی وشـەی (الشـیء) لێـرەدا، ئەوانـەی پـێش ئێمـە و ئێمـەش زۆربەمان واتێیگەیشتوین تەنها مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك دەگرێتەوە، قورئـان لـەم ئایەتـەدا كـۆی كردوونەتـەوە و هـەواڵی لەبارەیانـەوە داوە كـە خـوای گەورە سـەرجەم بـەدیهێنراوە زینـدووەكانی بـە نێـر و مـێ دروسـتكردووە، بەڵام ئەگەر فراوانتر بڕوانینە وشەی (شیء) گشتگیرییەكی زیـاتر لـە ڕووەك و ئاژەڵ و مرۆڤی تێدا دەبینین، بەڵكو (بێگیان) یش دەگرێتەوە... پرسـیار لێرەدا ئەمەیە: ئایـا نێـر و مـێ لـە بێگیانـدا هەیـە؟ بـۆ وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارە پێویسـتمان بـە گەشـتێكی خێـرا هەیـە بـە نێـو فیزیـای تەنۆلكـە سەرەتاییەكاندا.

لەنیوەی یەكەمی سەدەی بیستەمدا یـەكێك لـە فیزیاییـە ئینگلیزەكـان بەناوی "دیراك Dirac" لێكۆڵینەوەی لەسەر هاوكێشەكانی ئەلكترۆن كرد. ئەلیكترۆن وەك دەزانین تەنۆلكەی بارگە سالبن بەدەوری نـاوكی گەردیلـەی ماددەدا و لە خولگەی تایبەتدا دەسوڕێنەوە. "دیراك" لـەكاتی ئەنجامـدانی ئەم لێكۆڵینەوانەدا بۆیدەركەوت كە هاوكێشەكان دوو شیكاریان هەیـە نـەك تەنها شیكارێك. هەر یەكێك لە ئێمە مامەڵەی لەگـەڵ هاوكێشـەی پلـە دوودا كردبێت بەئاسانی لەم حاڵەتە تێدەگات. هاوكێشـە پلـە دووەكـان دووجـای بڕێكـی نـەزانراویان تێدایـە و بـڕی دووجـایش هەمیشـە موجەبـە و هـەمان ئەنجام دەدات. مانای ئەوەش وایە كە ڕەگی دووجای بۆنموونـە ژمـارە (٤) یان (٢)دەبێت یان (−٢) دەبێت.

هەڵبەتە هاوكێشەكانی "دیراك" لەم نموونەیـە ئـاڵۆزترن، بـەڵام بنـەمای سەرەكییان هەر یەكە. "دیراك" گەیشتە دوو كۆمەڵـە هاوكێشـە، كۆمەڵـەی

یەکەم بۆ ئەلیکترۆنە بارگە سالبەکان و ئەوانی تر بۆ تەنێکی نەزانراو کە بارگەی موجەبی هەیە. "دیراك" چەند هەوڵێکی سەرنەکەوتوی دا بۆ لێکدانەوەی ئەم تەنۆلکە نەزانراوە... ئەو باوەڕی بە بوونی هەبوو، بەڵام فیزیاییەکانی تر دانیان نەدەنا بە بیرۆکەی هەبوونی تەنۆلکەی بارگە موجەبدا کە دەگونجێت بەتەواوی دژی ئەلیکترۆن بێت. بەتەواوی وەك ئەوەی ئەندازیارێك مامەڵە لەگەڵ هاوکێشە پلە دووەکاندا دەکات، دژی بوونی درێژی و بارستایی سالبە.

پاش چەندین ساڵ لە هەوڵ و کارەکانی بیردۆزی "دیراك" و لە سەرەتای سییەکاندا شوێنەواری ئەم تەنە نەزانراوە دۆزرایەوە، لە ئامێرێکدا کە پێیدەوترێت (Cloud Chamber) ژووری هەڵم. لەکاتی لێکۆڵینەوەی کاریگەری بواری موگناتیسی لەسەر ئەم شوێنەوارانە، دۆزرایەوە کە بارستایی ئەم تەنۆلکەیە یەکسانە بە بارستایی ئەلیکترۆن، بارگەی موجەبی هەیە و یەکسانە بە بارگەی ئەلیکترۆن، لەبەرئەوە ئەم تەنۆلکەیە ناونرا بە دژ. لەپاش ئەمەوە دەستکرا بە لێکۆڵینەوە لە دژە تەنۆلکەکانی تر... مانای بوونی دژ بۆ ئەلیکترۆن (Positron) یان (Anti-electron) واتە بوونی دژ بۆ تەنۆلکەکانی تریش. کرداری دۆزینەوەی ئەم دژانە یەك لەدوای یەك دەستیپێکرد و بۆ چەند جۆرێك دابەشکران، ئێمە لێرەدا ناچینە نێو درێژەی ئەم باسەوە و تەنها ئاکامی کۆتایی باس دەکەین کە هەموو تەنۆلکەیەك دژی هەیە، بەڵکو هەموو تەنێك دژی خۆی هەیە.

زانا "پاوڵ دیفیز" لەساڵی (١٩٩٥ز) دا خەڵاتێکی جیهانی وەرگرت (نرخەکەی یەك ملیۆن دۆلار بوو) بەرامبەر بەو لێکۆڵینەوانەی جەخت لەسەر پەیوەندی نێوان زانست و ئایین دەکەنەوە. "پاوڵ دیفیز" چەند دانراوێکی هەیە، دیاریترینیان (خوا و فیزیای نوێ) یە. تیایدا دەڵێت:

"ڕاستییەکانی زانستی فیزیای نوێ باوەڕبوون بە خوا و ڕۆژی دوایی و غەیب لەدەروونی مرۆڤدا قووڵ دەکەنەوە".

دۆزینەوەی دژە مادده، هەواڵی ئەگەری بوونی جیهانێکی تر دەدات کە هاوتای جیهانە ماددییەکەی خۆمانە و لە دژە تەنۆلکەکان پێکدێت، واتە لە دژەمادده پێکدێت.

ئایا ئەو جیهانە کامەیە کە لە دژەمادده پێکدێت؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە تائێستا هیچ کەس نەیتوانیوە وەڵامی بداتەوە. زەوی لەبنەڕەتدا لە مادده پێکدێت نەك دژەمادده، بەڵام دژەمادده کە لە تیشکە گەردوونییەکانەوە (Cosmic rays) پێکدێن، کاتێکی زۆر لە کەشی زەویدا ناژین.

تەنها لە تاودەرەی تەنۆلکەکاندا (Particle Accelerator) خێراییەکەیان هەندێك کەمدەکات، تا دەگاتە ئەو حاڵەتەی کە ناتوانێت لێی دەربازبێت ئەویش لەناوچوون و فەنابوونە بەهۆی ماددەی بەرامبەریەوە کە لە کەشی زەویدا بەبڕێکی ئێگجار زۆر هەن. کاتێك تەنۆلکەیەك لەگەڵ دژەکەیدا یان ماددەیەك لەگەڵ دژەکەیدا بەیەکدەگەن، هەریەکەیان ئەوی تر لەناو دەبات و هەردووکیان دیارنامێنن، وەك تەقینەوەیەك هەردووکیان دەگۆڕێن بۆ وزە کە گەورەترینیان لەشێوەی تیشکی (گاما)یە.

یەکێك لەو پەنهانانەی فیزیاییەکانی سەرسام کردووە بڕی دژەکانە کە هاتوونەتە پێکهاتەی ئەم گەردوونەوە... ئایا زەوی بە نموونەیەکی بچوککراوە دادەنرێت بۆ بەشەکانی تری گەردوون؟ واتە ئایا ڕێژەی مادده لە هەموو گەردووندا لە ڕێژەی دژەکانیان زیاترە وەك ئەوەی ئێستا لەزەویدا هەیە؟ دەتوانین ئەوە یەکلایی بکەینەوە کە ڕێژەی دژەماددەکان لە گەلەستێرەکەماندا ڕێژەیەکی کەمە، ئەگەر وانەبوایە ئەوا زۆربەی ئەو ماددانەی لەنێوان ئەستێرەکاندا هەن لەناو دەچوون و چاودێرە

گەردوونییەکانیش بڕێکی زۆر زیاتر لە تیشکی (گاما)یان تۆماردەکرد، بەڵام کـێ زانیاریمـان دەداتـێ ئـەم مەسـەلەیە جیـاواز نییـە بـۆ گەلەسـتێرە دوورەکانی تر کە دەکەونە لێـوارە دوورەکـانی گەردوونـەوە؟! دەگونجێـت گەلەسـتێرە هـەبن بەتـەواوی لـە دژەئەسـتێرە پێکبـێن و پێیـان بوترێـت دژەگەلەستێرە.

ئەگـەر دانماننـا بـەبوونی دژێـك بـۆ گەلەسـتێرە، خۆمـان لەبـەردەم پرسـیارێکی تـری سەرسـوڕهێنەردا دەبینینـەوە، ئـەویش : چـی ڕێ لـە نزیکبوونەوەی گەلەستێرە دەگرێت لە دژەکەی و پاشان لەناوچوون و فـەنا بوونیان؟ ئایا ئەم بـیردۆزە لێکدانـەوە و ڕاڤەیـەکی نوێمان بۆ ئـەو ئایەتـە دەداتــێ کــە دەفــەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا﴾فـــاطر/٤١، واتـــە: بەڕاستی هـەر خوایـە ئاسمانـەکان و زەوی ڕاگرتـووە و نایـەڵێت تێکبچـن و لەیەك بترازێن، خۆئەگەر تێکبچن و لەیەك بترازێن، کێ دەتوانێت جگـە لـەو زاتە فریایان بکەوێت و بەڕاستی هەر ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام خـۆگر و ئارامگر و لێخۆشبووە.

ئەگــەر ئــەو حاڵەتــە ڕووبــدات ئــەوا پەرشــبوونی گەلەســتێرەکان و دژەکانیان و لەناوچوونیان بەم ڕێگایە لەچەند سـاڵێکدا تـەواو دەبێـت و لـە ئاکامـدا بڕێکـی ئێگجار گـەورە لـە وزە دەردەچێت، وەك ئـەوەی ئاسمـان ڕۆنێکـی قرچـاو بێـت، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ﴾الرحمن/٣٧، واتە: کاتێك دێت ئاسمان لەت دەبێـت و وەکو گوڵێکی سوور دێتە بەرچاو، یاخود وەك ڕۆنی قرچاوی لێدێت.

ئێمە ناتوانین وێنای لەتبوون (إنشقاق)ی ئاسمـان بکـەین، چـۆن پـەرت دەبێت؟ کام بەشەی لەت دەبێت؟ بەڵام ئەگەر ڕوویـدا و گەلەسـتێرەکەمان

لەگـەڵ دڕەکەیـدا پەرشـبووەوە، ئەمـە مانـای پەرشـبوونەوەی هـەموو ئاستەکانی گەلەستێرەیە کە ئێمە لەناویدا دەیبینین، وەك ئەوەی گـەردوون بکاتە دووبەشەوە، ئەمەش وەك ئەوەی کە ئاسمـان قڵیشـابێت، لەمکاتـەدا ئەستێرەکان وندەبن و دەکوژێنەوە. هەر ئەسـتێرەیەك کاتێـك لـە دڕەکـەی نزیك دەبێتەوە لەناو دەچێت و پەرش دەبێتەوە. پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ﴾المرسلات/٨-٩، واتە: کاتێـك دێـت ئەستێرەکان ڕووناکییان نامێنێت، ئاسمانیش لەت دەبێت و لێکدەترازێن.

کـاتێکیش ئەسـتێرەکان بـەم ڕێگایـە پـەرش دەبـن و بارسـتەکەیان دەگۆڕێت بۆ وزە، لەمکاتەدا ئەو هێزی ڕاکێشانە نامێنێـت کـە هەسارەکان بـەرەو ئەسـتێرەکان لـە ڕێڕەوەکانیانـدا کـێش دەکـات، هەسارەکان لـە ڕێڕەوەکانیـان دەردەچـن و پـەرش و بڵاودەبنـەوە. خـوای پـەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ﴾الإنفطــار/١-٢، واتە: کاتێك ئاسمان لەتلەت و پارچە پارچە دەبێت، کاتێك کـە ئەسـتێرە و هەسارەکان پەرش و بڵاودەبنەوە و ورد و خاش دەبن. ئـەنجامی ئەوانـەش تێکچـوونێکی گەورەیـە لەسـەر زەوی، خـوا دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ﴾التکویر/٦، واتە: کاتێك دەریاکـان گڕ دەدرێـن. یـان دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ﴾التکویر/٣، واتە: کاتێك کە کێوەکان لە شوێنی خۆیان هەڵدەکـەنرێن و بـەملاولادا بـران. یـان دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ﴾الأنفطـار/٤، واتـە: کاتێـك کـە گۆڕەکـان ژێـرەوژوور دەکـرێن (مردووەکانی ناویان دەهێنرێنە دەرەوە و زیندوو دەکرێنەوە).

ئەمانە لە نیشانەکانی هـاتنی ڕۆژی دوایـین کـە خـوای گـەورە هـەواڵمان لەبارەیانـەوە پێـدەدا و بابـەتی فیزیـای تەنۆلکـەکان و دڕەکانیـان

لێكدانەوەيمان دەدەنێ، لەناوچوونى مادده و دژەكەى بووەتـە ڕاسـتييەكى زانستى كە ڕۆژانە لـە تـاودەرەى تەنۆلكەكانـدا ڕوودەدات و وزە بـۆ مـادده دەگۆڕێت.

ئێستا ئەگەر بگەڕێينـەوە بـۆ ئايەتـە پيرۆزەكـە: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ﴾ دەبينين وەلامەكـەمان دەبێتـە ئـەوەى كـە بێگيـان ياخود مـادده بەشێوەى جووت يـان دوانـە هـەن (مـادده و دژەكـەى). بەديهێنـەرى توانـا تـەنها مـرۆڤ و ئـاژەڵ و ڕووەكـى لەشـێوەى نێـر و مـێ يـان دوانـەدا نەخولّقاندووە، بـەڵكو لـە هـەموو شـتێك دوانـەى بـەديهێناوە، تەنانـەت لـە بێگيـان و ماددەيشـدا، ئەمـەش ئـەو لێكدانـەوە گشـتگيرە تەواوەيـە كـە لەئايەتەكەدا دەبينرێت.

"محمد عبدالسلام"ى بە ڕەگەز پاكستانى كە فيزيايييەكى موسڵمانە و لە ساڵى (١٩٧٩ز)دا خەلاتى نـۆبڵى لـە فيزيادا وەرگرتـووە، لێكۆڵينەوەيـەكى گرنگى هەيە لە بابەتى تەنۆلكەكان و دژەكاندا و ڕۆڵێكـى گـەورەى هـەبووە لە دانانى بيردۆزى يەكخستنى هەردوو هێزى سەرەكى لـەنێوان چـوار هێـزە كاريگەرەكەى گـەردوون، ئـەوانيش هێـزى كارۆموگناتيسـى و هێـزى ناوكـە ئەتۆمى لاوازە. دواى بەدەستهێنانى خەلاتەكەى، ئەم زانا موسڵمانە دەڵێت ئـەو ئايەتـەى قورئـان كـە دەفـەرموێت: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ﴾ بەجێگـەى سروشـێكى بـەهێزبووە بـۆى لـەكاتى لێكۆڵينەوەكانيـدا لەسـەر دژەكانى تەنۆلكە مادديەكان.

**پوختەى ئيعجازى ئايەتەكـە** ئەوەيـە: وەك چـۆن سـيفەتى دوانـەيى لـە جيهانى ئاژەڵ و ڕووەكەكاندا و نێر و مێ لە مرۆڤدا هەيـە، بەهـەمان شـێوە سيفەتى دوانەيى لە دونياى ماددەشدا هەر بوونى هەيە.

# گواستنەوەی عەرشەکەی بەڵقیس

خوای پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾النمـل/ ٤٠، واتـە: (یـەکێك لـە پیاوچـاکان) کـە زانسـت و زانیـاری لـە (نهێنیـەکانی) کتـێبی تـەورات هـەبوو وتـی: مـن بـە چاوتروکاندنێك بۆت دەهێنم.

چیرۆکی سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) و بەڵقیس (پادشای سـەبەء) و بابەتی گواستنەوەی عەرش بابەتێکی سیحرئامێز بـوو. چۆن مـەخلوقێك (لەوسەردەمەدا) دەتوانێت عەرشی پادشای (سبأ) ئامادەبکـات لـەدووری هەزاران کیلۆمەترەوە، لەبەشێکی چرکەیەکدا، واتە بـەر لـەوەی سـولەیمان چاو بتروکێنێت؟ بەلاَم زانستی نویێ هەواڵمان دەداتێ کە ڕوودانی ئەو کـارە لەڕووی زانستییەوە دەکرێت ڕووبـدات، یـاخود بەلایـەنی کەمـەوە لـەڕووی تیۆرییەوە، بەگوێرەی توانایمانەوە لـە سـەدەی بیسـت و یەکـدا... دەبێـت ئەوە چۆن ڕووبدات؟ ئەوە باس و بابەتەکەمانە ! !

مادده و وزە دوو وێنەی جیاوازی یەك شـتن، دەکرێـت مـادده بـۆ وزە و وزەش بۆ مادده بگۆڕرێت، ئەوەش بـەپێی هاوکێشـەیەکی ناسـراو... مـرۆڤ سـەرکەوتوو بـووە لـە گـۆڕینی مـادده بـۆ وزە، ئـەوەش لـە کارلێکـە ناوکییەکاندا کە کارەبا دروست دەکەن، گەرچی دەستبەسـەرداگرتنی ئـەم گۆڕانە، تائێستاش گۆڕانکاری نوێی بەسەردا دەکرێـت ڕووەو باشـترکردن و

گەشــەپێدان... بەهــەمان شــێوە مــرۆڤ ســەرکەوتووش بــووە (گەرچــی بەڕادەیــەکی کەمیشــە) لــە گــۆڕینی وزە بــۆ مــاددە، ئــەوەش لــە تەنۆلکــە تاودەرەکاندا (particle accelerator) ئەم کردارە تا هەنووکە لەسـەر ئاستی تەنۆلکەکاندا ئەنجام دەدرێت، بۆیە گۆڕینی ماددە بۆ وزە و وزە بۆ ماددە کارێکە لەڕووی زانستی و کرداریشەوە گونجاوە.

لەڕاستیدا گەیشتن بەڕێگاگەلی زانستی و هۆکارگەلی کرداریـی شیاو بـۆ گۆڕینی وزە بۆ ماددە و ماددە بۆ وزە بەسوك و ئاسانی، بە پێشـکەوتنێکی زانستی و هونەری مەزن دادەنرێت. ئاستی ئێستای زانستی و کرداریمان لەم بوارەدا تەنها لـە ئاسـتی منداڵێکدایـە کـە تـازە فێـری خوێندنـەوە دەبێـت. ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان مرۆڤ توانی بە سوك و ئاسانی لە نێوان ماددە و وزەدا ئاڵوگۆڕ بکات، ئەودەمە گۆڕانی ڕیشەیی بەڵکو شۆڕشی مـەزن لـە شـێوازی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤدا ڕوودەدات. یـەکێك لـەو هۆیانـە ئەوەیـە کـە دەکرێـت وزە بــەخێرایی ڕووونــاکی لەســەر شــێوەی شــەپۆلی مــایکرۆیی بــۆ هــەر جێگایەکی خواستراو بنێررێت، لەپاشان دەیگەڕێنینەوە و دەیگۆڕینەوە بـۆ ماددە! بەوەش دەتوانین هەر ئامێرێك، تەنانەت ماڵێك بەتەواوی بنێرین بـۆ هەر بەشێکی سەرزەوی، یاخود تەنانەت بـۆ سـەر مـانگ یـان مـەریخ، ئـەو کارە لە ماوەی چەند چرکەیەك یان چەند خولەکێکدا بەئاکام دەگات.

ئەو ئاستەنگەی فیزیاییەکان بۆ بەدیهێنانی ئەم خەونە دەیبینن ڕیزبەند بوونەوەی گەرد یاخود گەردیلەکانی ماددەکانـە بەتـەواوی لەسـەر شـێوەی بنەڕەتییەکانیان. یەکێکی تر لـە ئاسـتەنگەکان کـە زانسـت ئێسـتا پێیـەوە گرفتارە چوسـتی (کەفائـەی) و وەرگـرتنی شـەپۆلە کارۆموگناتیسـییەکانی ئێستایە کە لە (٦٠٪) تێپەڕ ناکات، ئەوەش لەبەر پەرشبوونەوەی زۆری لـە هەوادا. هەموو ئەوەی باسکرا دەرخستێکی کورتی هەڵوێستی زانست بـوو و

بەرتوانایی ئێستا لە گۆڕینی مادده بۆ وزە و بەپێچەوانەشەوە... با ئێستا بۆ بابەتی گواستنەوەی عەرشی بەلقیس شا بگەڕێینەوە.

ڕاڤەی لۆژیکی ئەو کارەی پیاوچاکەکە ئەنجامیدا (ئەوەی زانستی لە تەورات هەبوو) -جا مرۆڤ بێت یان پەری- بەپێی زانستی ئێستامان ئەوەیە: ئەو هەستاوە بە گۆڕینی عەرشی پادشای (سبأ) بۆ جۆرێك لە وزە، کە مەرج نییە لەسەر شێوەی وزەی گەرمی بووبێت، وەك ئەو وزەیەی لە بنکەکانی کارلێکە ناوەکییەکانی ئێستادا چنگ دەکەون. وزە وێکچوی وزەی کارەبایی یان ڕووناکییە و دەکرێت بەهۆی شەپۆلی کارۆموگناتیسییەوە بۆ جێگای مەبەست ڕەوانە بکرێت.

هەنگاوی دووەم ئەوەیە کە هەستاوە بە ناردنی ئەو وزەیە لە سەبەئەوە بۆ سولەیمان پاشا، لەبەر ئەوەی خێرایی بڵاوبوونەوەی شەپۆلە کاروموگناتیسییەکان هەمان خێرایی بڵاوبوونەوەی ڕووناکییان هەیە (واتە ٣٠٠ هەزار کیلۆمەتر لە هەر چرکەیەکدا)، ماوەی گەیشتنی بۆ لای سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) سێ هەزار کیلۆمەترە.

هەنگاوی سێیەم و کۆتایی گۆڕینی ئەو وزەیەیە لەکاتی گەیشتنیدا جارێکی تر بۆ مادده، بۆ هەمان شێوەی پێشووی، واتە هەموو گەردیلە و هەموو گەردەکان بۆ شوێنی یەکەمجار و سەرەتایان گەڕاونەتەوە.

مرۆڤی ئەم سەردەمە ناتوانێت ئەو کارە بکات کە کەسەکە (ئەو کەسەی زانستی لەتەورات هەبوو) بەر لە دوو هەزار ساڵ کردی. توانای ئێستای مرۆڤ لەوە زیاتر تێپەڕ نابێت کە هەوڵی ڕاڤەکردن و تێگەیشتنی ڕووداوەکە بدات. ئەوەی مرۆڤ تێیدا سەرکەوتوو بوو گۆڕینی بەشێك بووە لە ماددەی توخمە قورسەکانی وەك یۆرانیۆم بۆ وزە بەهۆی کەرتبوونی گەردیلەکانی ئەو توخمانەوە، بەڵام کارلێکە ناوەکییەکانی تر کە بە یەکبوونی توخمە

سـوکەکانی وەك هایـدرۆجین و هیلیـۆم دروسـت دەبێـت (وزەی خـۆر و ئەسـتێرەکان بەرهـەم دێنێـت) تـا هەنووکـەش مـرۆڤ توانـای دەستبەسەرداگرتنی تەواوی نییە. تەنانەت ئەگەر مرۆڤ لە کۆنترۆڵکردنی وزەی یەککگرتنی گەردیلەییدا سەرکەوتوو بوو، هێشتا وزەی بەرهەمهاتوو لە شێوەی سەرەتاییدایە و گرانە بەبێ لەدەستدانی بەشێکی زۆر لە وزەکە بۆ دووریی زۆر بنێردرێت.

گۆڕانی مادده بۆ شەپۆلی مایکرۆیی ئێستا بەشێوەیەکی ئاسایی ئەنجام دەدرێت (لە دیمەنێکی سەرەتاییدا) کە پێویستی بە گۆڕانی ماددەیە بۆ وزەی گەرمی پاشان بۆ وزەی میکانیکی پاشان بۆ وزەی کارەبایی و دواجاریش ناردنی لەسەر شەپۆلی مایکرۆیی. لەبەرئەوە دەبینین بەشێکی زۆری ئەو ماددەیەی سەرەتا بەکارمان هێنا لەڕێی ئەو گۆڕانانەوە لەناو دەچێت تەنها بەشێکی کەمی دەمێنێتەوە و دەتوانین لەڕێی شەپۆلە مایکرۆییەکانەوە بینێرین. چوستی گۆڕینی مادده بۆ وزەی گەرمی پاشان وزەی میکانیکی دواتر وزەی کارەبایی لە(٢٠٪) زیاتر نییە. تەنانەت ئەگەر لاوازیی ئێستای تەکنەلۆژیامان تێپەڕاند لە گۆڕانی یۆرانیۆم بۆ وزە، ئەوەی دەگۆڕێت بۆ وزە بەشێکی کەمی بارستایی یۆرانیۆمەکەیە، بەڵام بەشێکی زۆری لە سوتەمەنی ناوەکیدا دەمێنێتەوە و بە درێژایی هەزاران و ملیۆنان ساڵ وزەکەی تیشکدەدات و بۆ چەند توخمێکی تر دەگۆڕێت کە کۆتاییەکەی بریتییە لە قورقوشم.

لەلایەکی تریشەوە دەبێت ئەو شەپۆلانە وەربگیرێن و پاشان دووبارە بگۆڕدرێنەوە بۆ وزە و پاشان بۆ مادده، هەموو گەرد و گەردیلە و تەنۆلکەیەك بچێتەوە جێگا بنەڕەتییەکەی خۆی، چوستی کۆکردنەوەی ئەم تیشکەش (ئێستا) و گۆڕینی بۆ وزەی کارەبایی بەهەمان شێوەی

نێردراوەکە لە (٥٠٪) پتر نییە، واتە: ئەوەی تا ئێستا لە ماددە بنەڕەتیەکە ماوەتـەوە، لـەدوای گـۆڕانی لـە مـادەوە بـۆ وزە و نـاردنی لـەڕێی شـەپۆلە کارۆموگناتیسییە مایکرۆییەکانەوە وەرگرتن و جارێکی تـر گـۆڕانی بـۆ وزە بریتییـە لـە (١٠٪)، ئەمـەش بەرلـەوەی هـەنگاوی کۆتـایی تـەواو بکرێـت، ئەویش گۆڕینی ئەو وزەیەیە بۆ ماددە.

ئەم قۆناغەی کۆتایی (واتە گۆڕانی ئـەم وزەیـە بـۆ مـاددە بنەڕەتیەکـە) تائێسـتا مـرۆڤ توانـای تـەواوکردنی نییـە، لەبەرئەوەیـە ئێمـە چوسـتی تەواوکردنی ئەم هەنگاوەی کۆتایی نازانین. ئەگەر وامانـدانا لـەژێر باشـترین بارودوخدا مرۆڤ توانی (٥٠٪) ی ئەو وزە ماوەیە بۆ ماددە بگۆڕێت، ئاکـامی کۆتـایی ئـەوەی پێـی دەگـەین کـەمترە لـە بـڕی (٥٪) ی ئـەو ماددەیـەی کارەکەمان پێ دەستپێکردووە.

ئەمەش مانای وایە ئەگەر بە عەرشەکەی بەلقیس دەستمان پێکرد و بـە هەر ڕێگایەك گۆڕیمان بۆ وزە و ئەم وزەیەمان بەشێوەی شەپۆلی مایکرۆیی نارد، پاشان ئەو شەپۆلانەمان وەرگرتەوە و جارێکی تر گۆڕیمانەوە بۆ وزە یاخود ماددە، ئەوا تەنها( ٥٪) ی عەرشـەکەی "بـەلقیس شـا"مـان دەسـت دەکەوێتەوە، ئەوەی تری لەمیانەی ئەو گۆڕانانەدا لەناودەچێت، ئەو بڕەش (٥٪ی ماددەی بنەڕەتی) بەس نییە بۆ دروستکردنەوەی بەشێکی بچـووکی عەرشەکەش، وەك قاچ یاخود دەسکی کورسیەکەی عەرشی پاشا.

ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز کەسـایەتی ئـەو کەسـەی کـە (زانسـتی لـە تەورات هەبوو) دیاری ناکات ئایا مرۆڤ بووە یان پەری؟!

لە زۆرێك لە تـەفسیرەکاندا باس لەوە کـراوە: ئـەو کەسـەی عەرشـەکەی "بـەلقیس شـا"ی گواسـتەوە مـرۆڤ بـووە، بـەناوی (آصـف بـن برخيـاء)، بۆچوونیش هەیە ئەوەی کارەکەی کردووە یەکێکی تـر بـووە لەپەرییـەکان.

ئەگەری هەبوونی مرۆڤێك لەو سەردەمەدا بەو پلە بەرزەی زانست و زانیاری ئەگەرێكی زۆر كەمە.

ئەو پەرییە سەركەوتوو بووە لە گۆڕینی عەرشـەكەی بـەڵقیس بـۆ وزەو پاشان ناردنی بۆ دووریی هەزاران كیلۆمەتر، پاشان دووبارە گۆڕینەوەی بۆ وێنە بنەڕەتیەكەی (مادده)، ئەمەش لەماوەی كەمتر لە چركەیەكدا، یـاخود لە چـەند چـركەیەكدا، ئەگـەر پێشـنیارەكەی پـەریی یەكـەم وەربگـرین كـە ئامــادەیی هــەبوو عەرشــەكە بهێنێــت بــەر لــەوەی ســولەیمان لەســـەر كورسیەكەی هەستێت.

ئاستی زانیاری و توانای هەریەكە لەو دوو پەرییە (یەكەم و دووەم) بـەر لە دوو هەزار ساڵ لە ئاستی زانیاری و توانای هونەری و زانستی مرۆڤی ئەم سەردەمە زۆر بەرزتر بووە.

# سەرچاوەکان

١. تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین
٢. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم، عبالرحيم الماردينى
٣. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم و السنة المطهـرة، يوسـف الحـاج أحمد
٤. الموسـوعة الذهبيـة في إعجـاز القـرآن الكـريم و السـنة المطهـرة، د.أحمـد مصطفى متولى
٥. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن و السنة، م.نايف منير
٦. موسوعة الإعجاز القرآنى في العلوم والطب و الفلك، د.نادية طيارة
٧. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن، هيثم جمعة بلال
٨. حقائق العلم الحديث (١-١٠)، عبدالرحمن العصافي
٩. الإعجاز العلمي في القرآن الكريم، محمد سامي محمد علي
١٠. معجزات القرآن، هارون يحيى
١١. الإعجاز العلمي في القرآن، السيد الجميلي
١٢. الإعجاز العلمي في السماء و الأرض، الشيخ أسامة نعيم
١٣. من آيات الإعجاز العلمي (السماء في القرآن الكريم)، د.زغلول راغب محمد النجار
١٤. مجلة الإعجاز، الهيئة العالمية للإعجاز العلمي
١٥. چەند پێگەیەکی ئینتەرنێت، بەتایبەت هەردوو پێگەی ئەلیکترۆنی:
www.55a.com
www.kaheel7.com